جەمال نەبەز

زنجیرەی کوردەوانی

ZIMANÎ YEKGIRTÛY KURDÎ

# زمانی یەکگرتووی کوردی



یەکێتیی نەتەوەیی [illegible]

زنجیرەی کوردەوانی

- ١ -

جەمال نەبەز

# زمانی یەکگرتووی کوردی

بڵاوکراوەی یەکێتیی نەتەوەیی خوێندکارانی کورد لە ئەورووپا

- ١٩٧٦ -

لە شاری بامبێرگ لە ئەڵمانیای رۆژاوا بە ئۆفسێت لەچاپ دراوە

نیگاری بەرگ بە دەستی هـ. کویشلەر (بەرلین)
کێشراوە .
ئەم نیگارە نیشانەیەکە بۆ زمانی کوردی
بە هەر چوار شێوەکەیەوە : دوو شێوەی
بنچینەیی و دوو شێوەی لاتەنیشت
کە بەزەویەکگرتن و چوونە نێویەك
دەچن .

(تەنێ ٦٠٠ دانەی لێ چاپکراوە)

پێشکەش

بە بیستونۆیەمین

بیرەوەری ی

کۆچی دوایی

ی ...

داماو

حوزنی موکریانی

بێ .

لە ٢٠/٩/١٩٧٦دا

## درۆشمی

## یەکێتی نەتەوەیی خوێندکارانی کورد لە ئەورووپا

و

خەنجەر    قەلەم

واتا

هێزی مێشک    و    هێزی چەک

** ئەگەر بیروباوەڕێکی ڕەسەن بیان بزوێنێ، ڕۆژ لە تاریکستان هەڵدێنن **

# سەرنجێکی پێویست ( * )

تێکۆشان بۆ هێنانەبەرهەمی زمانێکی یەکگرتووی وا، کە کوردی هەموو لایەکی کوردستان و جیهان، بێ گوێدانە جیاوازیی شێوەی قسەکردنیان، تێی بگەن و پێی بخوێننەوە و پێی بنووسن، ئاواتێکی کۆنی رۆشنبیرانی کورد بووە. ئەوەتا نیشتمانپەروەری کورد؛ حاجی قادری کۆیی (١٨١٧ـ ١٨٩٦/ ٧) لە سەدەی رابوردوودا، داخ و خەفەتی بۆ ئەم پاشاگەردانیی زمانە خواردووە و گوتوویەتی:

((لە فەزی کوردی بەلاو نەبوو، گرد بوو × وا لە مابەینی ئێمەدا تێکچوو))

لەوساکەوە و هەتا ئێستەش، کەموزۆر؛ لە گۆڤار و رۆژنامە و نووسراوی کوردیدا، باسی یەکگرتنی ئەم شێوانە هاتووەتە پێشەوە؛ بەڵام ئەوەی راستی بێ، تا ئێستە هیچ جۆرە هەوڵێکی رێکوپێکی زانستانە بۆ گەیشتنە ئەم ئامانجە لە هیچ لایەکەوە نەدراوە.

ئۆبالی بەشێکی ئەم ئاژاوەی زمانە بە ئەستۆی ئەو حاڵەیە کە کورد تێیدا دەژی و گوناهی بەشێکی دیشی بە ئەستۆی رۆشنبیرانی کورد خۆیانە، کە لەم رووەوە تا ئەمڕۆ بەردێکیان نەناوەتە سەر بەردێک. جا ئەگەر تا ئێستە بەڵگەی ئەوانەی بڕوبیانوو دێننەوە بۆ کارنەکردن ئەوە بووبێ کە رۆشنبیرانی کورد ماوە و سەربەستیی بەرهەمهێنانیان نەبووە، ئەوا لە ئێستە بەدواوە ئەو بیانووەش نەماوە. کورد ـ نامە خوا ـ بە تایبەتی لە عێراقدا، گەلێک داوودەزگای زمانەوانی و هونەری و سیاسی و کۆمەڵایەتی و رۆشنبیری و خوێندەواریی هەیە و ئەگەر کاربەدەستانی ئەم رێکخراوانە بیانەوێ لەسەر بنچینەیەکی زانستانە و بۆ خزمەتی ئەم ئامانجە؛ لەگەڵ یەکدا دڵسۆزانە هاوکاری بکەن؛ ئەوا دەکارن (دەتوانن) لەم مەیدانەدا هەنگاوێکی فراوان بنێن و لەوانەشە بەردی بناغەی زمانی یەکگرتووی کوردی لە جێی راستەقینەی خۆیدا دابنێن.

نووسەری ئەم چەند لاپەڕەیە، وەك زمانەوانێکی کورد، خۆی بە بەرپرسیار دەزانێ بەرامبەر ئەو ئەرکەی کەوتووەتە سەر شانی. لەبەر ئەوە ناتوانێ بێ لایەن بوەستێ لە ئاستی ئەو کەینوبەینانەدا کە لە دژی زمانی نەتەوەکەمان دەکرێ؛ لە ژێر پەردەی دڵسۆزیی رواڵەت و شارەزاییی درۆزنە و جرتوفرت و چاوبەستدا. بۆیە بە پێویستی دەزانێ؛ هێندێ لەو زانیارییانەی کە لە ماوەی بیست و دوو ساڵ خەریکبوونیدا بە زمانی کوردییەوە کۆی کردوونەتەوە، چ لە کاتێکدا کە لە کوردستان ژیاوە و چ لە کاتێکدا کە لە زانستگەکانی ئەورووپادا خوێندوویەتی و دەرزی تێدا ووتوونەتەوە، پێشکەش بە هاووڵاتییەکانی بکا، بۆ سەرنج لێدان و لێکۆڵینەوە و کردنی بە بنچینەیەك بۆ دەستەقە لە سەرکردن.

نووسەر خۆی زۆر بە بەختیار دەزانێ کە وا نزیکەی دە ساڵ زیاترە لە وڵاتێکدا دەژی کە بە هەزاران کرێکار و خوێندکاری هەموو لایەکی کوردستان رووی تێدەکەن. هەر لە کرمانج و هەورامی و موکری و زازاوە بگرە، تا دەگاتە لەك و فەیلی و سۆرانی و کرماشانی و گەرمیانی و سنەیی. بەتایبەتی؛ دەرزووتنەوەم بە هێندێك لەم کرێکار و خوێندکارانە و تۆمارکردن و سەرنجدان و لێکۆڵینەوەی شێوەی جۆرجۆری قسەکردنیان و بەستنی ئەو

زمانەوانی یە زانستانەیەی لە زانستگەکاندا فێری بووە، بە تاقیکردنەوەی ڕۆژانەیەوە، ئاسۆیەکی وا فراوانی بۆ کردووەتەوە کە دوورنی یە تا ئێستە بۆ هیچ کوردێکی دی و هیچ بێگانەیەك نەکرابێتەوە. لەبەر ئەوە بە پێویستی دەزانێ چەند نامیلکەیەك لە بارەی ((کوردەوانی)) یەوە (١) بڵاوبکاتەوە بە نیازی خزمەتی زمان و کولتووری گەلەکەمان.

هەرچەندە ئەم نامیلکەیە نەدەبوو ببێتە پێشڕەوی زنجیرەیەکی وەك ((کوردەوانی))، بەڵکوو دەبوو جارێ هێندێك زانیاری لە بارەی شوێنی زمانی کوردی یەوە لە خێزانی زمانە ئێرانی یەکان و هیندۆجەرمەنی یەکاندا نیشان بدرێ و خۆماڵەکانی زمانی کوردی بەگشتی و شێوەکانی بە تایبەتی، لە چوارچێوەیەکی فراوانتر و باسێکی قووڵتردا بخرێنە بەرچاو، بەڵام لەبەر ئەوەی زمانەکمان ئەمڕۆ بە دەورێکی زۆر نازکدا تێدەپەڕێ و مەسەلەی زمانی یەکگرتووی کوردی، مەسەلەیەکی یەکجار گرنگە کە نابێ دوابخرێ، بۆیە ئەم باسە پێش ئەوانی دی خرا.

نووسەر هیوای وایە کە ڕۆشنبیرانی کورد، سا سەربە هەر لاو دەستە و بەرە و کۆمەڵە و بیروباوەڕێك دەبن با ببن، هاوکاری لەگەڵدا بکەن و بەرهەمی لێکۆڵینەوەکانی لە سنوورێکی پان و چاوتێرانەدا بڵاوبکەنەوە و بەوە کەرەستەی دەستەقەیەکی گەرم لەم بارەیەوە بێننە کایەوە.

ئیتر دەست لە دەست و هێز لە گەل و پشتگیریش لە ئێزدانی زانای مەزن.

بەرلین ١٢/٢/١٩٧٤.

جەمال نەبەز

مامۆستای ئێتنۆلۆژیای گەلانی ئێران،
هەروەها زمان و کولتووری کورد
لە زانستگەی ئازاد لە بەرلین
و ئەندامی کۆڕی لێکۆڵینەوەی زانستانە
لە ئەڵمانیای ڕۆژاوا

## ١ – سەرەتا

نزیکەی حەقدە ساڵ لەمەوبەر، لە نامیلکەی ((خوێندەواری بە زمانی کوردی)) دا، زۆر بە کورتی لەم باسە دووام و نە بوونی شێوەیەکی ئەدەبیم بە کۆسپی هەرە گەورەی ڕێی پێشکەوتن و بڵاوبوونەوەی زمانی کوردی دانا، پاش بەربەرەکانێی ڕاستەوخۆی زمانەکە لە لایەن داگیرکەرانی کوردستانەوە. هۆی ئەم یەکنەگرتنە و جۆری چارەسەرکردنیشیم؛ بە پێی دەسەڵات و سەرنجی ئەو کاتەم، زۆر بە کورتی خستە بەرچاو (٢). لەم ماوە دوورودرێژەدا، چەند باسێکی کەمی لەم بابەتە لە لایەن هێندێ کەسی دیەوە خرانە بەرچاو. بەشێك لەو باسانە زۆر سادە و نەزانانە بوون و پێویست بە نێوبردن ناکەن و هێندێکی دیشیان تا ئەندازەیەك زانستانە بوون و باسکردنیان بە ڕەوا دەزانم. بە تایبەتی ئەو کتێبەی کە دوکتۆر عێزەددین مستەفا ڕەسووڵ لە ساڵی ١٩٧١ دا بە نێوی ((سەرنجێ لە زمانی ئەدەبی یەکگرتووی کوردی)) یەوە بڵاوی کردەوە. هەروەها وتارەکەی مامۆستا تۆفیق وەهبی بە نێوی ((زمانە ئەدەبیەکمان چۆن توانا و ئاسانتر بکەین)) لە بەرگی یەکەمی ((گۆڤاری کۆڕی زانیاری کورد)) دا (١٩٧٣ ل ٢٩–٣٤).

جا بەرلەوەی بچمە گەرمەی باسەکەوە، بە پێویستی دەزانم ئەوە بڵێم کە هیچ گەلێك نییە لەم جیهانەدا، تێکڕای کۆمەڵانی خەڵکەکەی بە یەك زمانی یەکگرتوو بدوون. لەبەر ئەوە بوونی چەند شێوەیەك لە زمانی کوردیدا، شتێکی سەیر و سەمەرە نییە. بۆ وێنە: لە وڵاتێکی وەك ئەڵمانیادا کە بە هەزاران ڕۆژنامە و گۆڤاری تێدا دەردەچێ و لە قوتابخانە و ڕادیۆ و تەلەفزیۆن (٣) و سینەماکانیاندا، بە شەو و بە ڕۆژ زمانێکی یەکگرتوو بەکاردەهێنرێ، کەچی ئێستەش کە ئەڵمانێکی بایەری بە شێوەکەی خۆی بدوێ، ئەڵمانێکی پرۆیزی زۆر بە ئاستەم لێی تێدەگا. جا وە نەبێ حاڵی زمانەکانی دی جیهان، لە زمانی پێشکەوتووی ئەڵمانی باشتر بێ. نە خێر! ئەوانیش هەر وانە. لەبەر ئەوە هیچ پێویست بەوە نییە پیاو بەزەیی بە خۆیدا بێتەوە. بەکورتی هەموو زمانێکی ئەم دنیایە چەند شێوەیەکی جیاوازی هەیە وەك کوردییەکەی ئێمە. بەڵام ئەوەی کە خەڵکی هەیانە و کورد نییانە؛ ئەوە زمانێکی یەکگرتووە بۆ خوێندن و نووسین و کاروباری گشتی.

جا ئەگەر ئێمە هەوڵی ئەوە بدەین ئەم شێوانە بکەینە یەك، واتا هەموویان بکەینە یەك شێوە؛ ئەوا با هەر لە ئێستەوە دڵنیابین کە تا ڕۆژی قیامەت ئەوە سەرناگرێ بۆمان. خۆ ئەگەر بێ و بۆ هێنانە بەرهەمی زمانێکی کوردیی یەکگرتووی وا تێبکۆشین کە قسەی پێکراو و پێی نووسرا؛ خەڵکی هەموو لا یەك وەك یەك تێی بگەن، ئەوە دیارە کارێکی گرانە، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا؛ شتێکی نەبوونەکراو (مستحیل) نییە و بە هەوڵ و تەقەلای زانستانەی بێ ووچان؛ دێتە کایەوە. تەنیا ئەوەیە دەبێ بزانین لە کوێوە دەستپێ بکەین و کێ دەست پێ بکا و چۆن دەست پێ بکرێ.

## ٢ – هۆیەکانی دروست بوونی زمانێکی یەکگرتووی ئەدەبی

با جارێ بزانین ئەو هۆیانە چین کە دەبنە هەوێنی پەیداکردنی زمانێکی یەکگرتووی ئەدەبی بۆ گەلێك و ئەمجا لەبەر ڕۆشنایی ئەو هۆیانە؛ مێژووی زمانی کوردی شی بکەینەوە:

أ – ڕێی سەپاندنی شێوەیەك بە سەر گەلێکدا.

ب ـ لە خۆوە دروستبوونی شێوەیەکی ئەدەبی ·
ج ـ هەوڵدانێکی ڕێکخراوی زانستانەی لەسەرخۆ بۆ هێنانە بەرهەمی زمانێکی ئەدەبی ·

## أ ـ ڕێی سەپاندنی شێوەیەک بەسەر گەلێکدا

ئەمە بەتایبەتی بۆ ئەو گەلانەیە کە هێشتا زمانێکی یەکگرتوویان نی یە، بەڵام قەوارەیەکی سەربەخۆی یەکگرتوویان هەیە· ئەو حەلە بۆ چارەسەرکردنی ئەمە؛ یا بە جۆرێکی دیمۆکراتی یانە،بیروڕای گشتی ی خەڵکەکە وەردەگیرێ، تا بزانرێ چ شێوەیەکی بە دڵە، یا ئەوەتە کاربەدەستان خۆیان شێوەیەک لە شێوەکانی زمانەکە دەکەنە زمانی ڕەسمی و بەو رەنگە دەیسەپێنن بەسەر گەلەکەدا و بەرەبەرە دەبێتە زمانی ئەدەبی یان·

ئەم ڕێیەیان بۆ کورد دەست نادا· چونکە ئەو دەنگ وەرگرتنە گشتی یە، یا ئەو بەزۆرسەپاندنەی بۆ جێبەجێ نابێ، بە هۆی نەبوونی قەوارەیەکی سیاسی ی یەکگرتووەوە· لەبەر ئەوە ئەو ڕایانەی لەم بابەتەوە تا ئێستە بوون و هەن؛ وەک ئەوەی لە ساڵی ١٩٣٤ دا کۆنگرەی کوردناسەکانی یەکێتی ی سۆڤێت بڕیاری دا کە شێوەی کرمانجی ی ژووروو بکاتە شێوەیەکی ڕەسمی بۆ هەموو کورد (٤) یا ئەوەی لە ئەیلوولی ساڵی ١٩٥٩ دا کۆنگرەی مامۆستایانی کوردی عێراق بڕیاری دا، بۆ ئەوەی شێوەی کرمانجی ی نێوەڕاست (سۆرانی) بکاتە شێوەی ڕەسمی (٥) لە خەیاڵێ بەولاوە هیچی دی نی یە· چونکە ناچێتە سەر، بە هۆی نەبوونی دەسەڵاتێکی سیاسی ی نێوەندی یەوە کە لە هەموو پارچەکانی کوردستاندا کار بکا ·

## ب ـ لە خۆوە دروستبوونی شێوەیەکی ئەدەبی

### ١ ـ چۆن شێوەیەکی ئەدەبی لە خۆیەوە دروست دەبێ ؟

هێندێ جار شێوەیەکی ئەدەبی لە خۆیەوە، واتا بێ سەپاندنی ڕاستەوخۆ، دروست دەبێ· بۆ ئەمەش هێندێ هۆ هەن کە لەم کارەدا دەور دەگێڕن، وەک:

١ ـ ئەوەی کتێبێکی ئاینی ی پیرۆز بەو شێوەیە بنووسرێتەوە· بۆ وێنە: شێوەی هۆزی قورەیش بوو بە شێوەی ئەدەبی ی عەرەبەکان؛ تەنیا لەبەر ئەوەی قورئان بەو شێوەیە هاتە خوارەوە· مارتین لووتەر (١٤٨٣ ـ ١٥٤٦) ی ئەڵمانیش کە داهێنەری ئاینزا (٦) ی پرۆتستانت و پێشەوای بزووتنەوەی چاککردنی ئاینی دیانێتی (واتا کاتۆلیکی) یە؛ پاش ئەوەی ئینجیلی لە لاتینی یەوە وەرگێڕایە سەر شێوەی ئەڵمانی ی ساکسی، کە تا ئەوحە لە تەنیا لە دیوەخانەکانی ئەمیرەکانی ساکسدا بەکاردەهێنرا، توانی سەرنجی خەڵکێکی زۆر بۆ ئەو ئینجیلە رابکێشێ و هەر بەو هۆیەوە شێوەی ساکسی بوو بە زمانی ئەدەبی ی هەموو ئەوانەی ئەمڕۆ بە ئەڵمانی دەدوون؛ هەر لە ئەڵمانیا خۆیەوە بگرە، تا دەگاتە سویسرا و نەمسا و گشت لایەکی دی ·

بەمەدا بۆمان دەردەکەوێ کە ئاین دەورێکی مەزن دەگێڕێ لە دروستکردنی زمانێکی ئەدەبیدا! · پێچەوانەی ئەمەش هەر ڕاستە · واتا؛ ئاین دیسانەوە دەورێکی مەزن دەگێڕێ لە دوولەتکردنی زمانێکی

ئەدەبیدا. بۆ وێنە: سریانەکان هەتا سەدەی پێنجی زایینی، زمانێکی ئەدەبیی یەکگرتوویان هەبوو. ئا لەم سەدەیەدا، ئاژاوە کەوتە کڵیسەی دیانەکانی ڕۆژهەڵاتەوە و بەوە خەڵکەکە بوون بە دوو بەشەوە و هەر لەوەشەوە ئایینزای یاقووبی و ئایینزای نەستووری پەیدابوون. ئەمجا وردە وردە، هەر لایە شێوەی تایبەتیی خۆی پاراست و پێی نووسی و ڕق و کینە و دووبەرەکیش دەورێکی ئاگرخۆشکەرانەی نواند بۆ دوورخستنەوەی هەردوو شێوەکە لە یەکتر، بە جۆرێ سریانەکان ئێستە دوو شێوەی ئەدەبییان هەیە. ئارییایی یە کۆنەکانیش (واتا هیندۆ ئێرانی یەکۆنەکان) لەسەرەتاوە بە یەك زمان دەدووان و یەك ئایینیشیان هەبوو. بەڵام پاش ئەوەی ئەوانەی هیندستان ئایینی خۆیان جیاکردەوە و لە دەوروبەری ٣٠٠٠ ی پ. ز دا کتێبی پیرۆزی (ڤیدا) یان بە شێوەی سانسکریت بۆ نووسرایەوە، ئەمجا کە دووای ئەوانیش ئارییایی یەکانی ئێران، ئایینی زەردەشتیان پەسندکرد و کتێبەکەیان بە زمانی (ئاڤێستا) بڵاوکردەوە؛ ئەو دەمە زمانی ئارییایی بەرەبەرە بوو بە دوو زمان: هیندی و ئێرانی، کە هەریەکەشیان لە سەرخۆ بوو بە چەند زمانێکی سەربەخۆ.

٢ــ ژیاندنەوەی ئەدەبیات بە تاقە شێوەیەکی زمانێك و لە سنوورێکی یەکجار فراواندا؛ دەبێتە هۆی دروستکردنی زمانێکی ئەدەبی. بۆ وێنە: زمانی فارسیی تازە لەو کاتەوە دروستبووە کە ڕوودەکی و فیردەوسی (٩٣٢؟ ــ ١٠٢٠) دەستیان بە هۆنراوە هۆنینەوە کردووە بە شێوەی دەری (واتا شێوەی ژوورووی ڕۆژهەڵاتی ئێران). بە تایبەتی شانامەی فیردەوسی دەورێکی کاری (فعّال)ی گێڕا لەم ڕووەوە و توانی هەموو شێوە و زاراواکانی دی ڕامالبکا و جێی خۆی بکاتەوە.

٣ــ خزمەتکردنی زانست بە تەنیا شێوەیەك، بە تایبەتی لە وڵاتێکدا کە زانستگە و کتێبی زانستانە و ڕۆژنامەی زۆروزەبەندە، هەر بە یەك شێوە ببێ و بە شێوەکانی دی نەبێ؛ دەبێتە هۆی ئەوەی ئەو شێوەیە بکاتە زمانێکی ئەدەبی.

٤ــ هێندێ جار جۆری ژیانی کۆمەڵایەتی و پێوەندی بازرگانی و ئابووری دەبنە هۆی دروستبوونی شێوەیەکی ئەدەبی. شارێکی زۆر گەورە، یا پێتەختی وڵاتێك کە ببێتە ناوچەی هاتوچۆ و بازرگانی و نان پەیداکردن و خەڵك ڕووی تێبکەن؛ شێوەی ئەو شارە دەسەڵات پەیدا دەکا و برەو دەستێنێ و لە ئەنجامدا دەبێتە شێوەیەکی ئەدەبی.

سەرنجێك لەمانەی سەرەوە بدەین؛ بە باشی بۆمان دەردەکەوێ ئەو هۆیانەی دەبنە ماکی دروستکردنی زمانێکی ئەدەبی لە خۆیەوە، تا ئێستە بۆ کورد نەڕەخساون.

## ٢ ــ بۆچی شێوەیەکی ئەدەبی کوردی لە خۆیەوە دروست نەبووە؟

### (١) ــ نەبوونی ئایینێکی کوردانەی گشتی

هەتا ئێستە لە نێو کورددا ئایینێکی گشتیی وا پەیدا نەبووە کە کتێبە پیرۆزەکەی بە زمانی کوردی نووسرابێتەوە و بووبێتە سەرمەشق بۆ زمانێکی یەکگرتووی ئەدەبیی پاشەڕۆژ. هەرچەندە گەلێك بەڵگە هەن بۆ ئەوەی کە زەردەشت پەیامبەر و داهێنەری ئایینی مەزدایەسنی (٧) لە ناوچەی مادەکاندا (واتا کوردستانی ئەمڕۆ) لە دایکبووبێ و بە زمانی خەڵکی ئەو شوێنەش قسەی کردبێ، بەڵام هیچ بەڵگەیەك بۆ ئەوە نییە کە کتێبی

(ئاڤێستا) بە تەواوەتی بە زمانی مادەکانی ئەو سەردەمە نووسرابێتەوە، یا چەند سەدەیەك پاش مردنی زەردەشت خۆی نەنووسرابێتەوە، ئەگەرچی واش باوە کە گوایە ((گاتاکان)) (٨) لە زمانی زەردەشت خۆیەوە بیستراون. جا هەرچەندە پەیوەندەی زمانی ئاڤێستا وکوردی ئەمڕۆ،لە باری زمانەوانی یەوە، شتێکە ئینکار ناکرێ ؛ لەگەڵ ئەوەشدا، پیاو ناتوانێ بڵێ ئەو زمانە کە کتێبی ئاڤێستای پێنووسراوەتەوە ؛ کوتومت پاشماوەی زمانی مادەکان بووە. یا بە ووتەیەکی دی ((کوردی ی نێوەڕاست)) بووە. ئەوەش لە کاتێکدا ئەگەر بتوانین زمانی مادەکان بە ((کوردی کۆن)) و کوردی ئەمڕۆش بە ((کوردی نوێ)) بدەینە قەڵەم. دیارە ئەم باسە باسێکی یەکجار فراوان و قووڵە وجێی ئێرە نی یە. بەڵام ئەوەی دانی پێدابنرێ ئەوەیە؛ فارسەکان پاش مادەکان بە ماوەیەکی زۆر، ئاینی زەردەشتیان وەرگرت. ئەگەرچی کوردەکان خۆشیان لە سەرەتاوە بەربەرەکانێی ئاینی زەردەشتیان زۆر کرد (٩) بەڵام هێشتا بەر لە فارسەکان بووبوونە زەردەشتی. فارسەکان لە زمانی شاپووری دووەمدا ئاینی زەردەشتی یان کردە ئاینی رەسمی ی دەوڵەت. بێجگە لەوەش دەستکاریکردنی ئاینی زەردەشتی و گۆڕینی و قەلبکردنی بیروباوەڕەکە لە لایەن فارسەکانەوە، شتێکە مێژوونووسەکان و ئەوانەی خەریکی لێکۆڵینەوەی ئەم ئاینە بوون،تەنانەت هێندێ لە زاناکانی فارس خۆشیان،بە ئاشکرا دانی پێدا دەنێن (١٠). هەرچی جۆرێ بێ، ئاینی زەردەشتی بە تەواوی لە نێو کوردەکاندا نەچەسپی بوو،کە سەرکردایەتی ی ئەو ئاینە کەوتە دەست فارسەکان و بە شێوەیەك کە بە دڵی کاربەدەستەکانیان بوو؛ خرایە روو. کە ئاینی ئیسلامیش لە دەوروبەری ٦٣٩ د. ز دا هاتە کوردستانەوە؛ بە ماوەیەکی کەم ئاینی زەردەشتی ی لە هەموو کوردستان و هەموو ئێراندا لە نێو برد و کتێبە پیرۆزەکەی کە قورئانە و بە عەرەبی نووسراوەتەوە،بە تەواوی جێی ئاڤێستای گرتەوە. کوردەکان هەرچەندە لە سەرەتاوە بەربەرەکانێی ئەم ئاینە شیان کرد (١١) بەڵام لە ئەنجامدا و لەبەر گەلێك هۆ، بەزۆری بوونە موسوڵمان و دەستیانکرد بە خزمەتکردنی ئاینی ئیسلام و زمانی عەرەبی. ئەوانەی کە لەسەر ئاینە کۆنەکانی کورد مانەوە؛ وەك ئێزدی یەکان، هەلێکی وایان بۆ نەڕەخسا کە ئاینەکەیان بکەنە ئاینێکی گشتی. لێرەدا پێویستە بڵێم کە پاش لێکۆڵینەوەیەکی چەند ساڵە و ووردبوونەوەیەکی زۆر، بۆم دەرکەوتووە کە ئاینی ئێزدی یەکان ؛ نە پێوەندی ی بە (یەزیدی کوری معاویە) وە هەیە و نە بە ئاینی ئیسلامەوە. واتا ئێزدی یەکان موسوڵمانی ساختە (١٢) نین. هەروەها ئێزدێتی پاشماوەی راستەوخۆی ئاینی زەردەشتیش نی یە. بەڵکو پاشماوەی ئاینی کۆنی کوردی پێشزەردەشتێتی یە. بەڵام ئەوە هەیە؛ بیروباوەڕی زەردەشتێتی و جوولەکەیەتی و دیانەتی و موسوڵمانەتی ی تێکەڵبووە. لەگەڵ ئەمەشدا،ئەم ئاینە لەو رووەوە کە هەر کەس لە باوك و دایکێکی ئێزدی نەبێ ؛ بە ئێزدی نادرێتە قەڵەم، ئەمجا ئەوەش کە شێوەی ئەو پەڕی نهێنێتی وەرگرتووە لە کارکردندا، بێجگە لەوەش لە نێو بردنی کتێبەکانیان و بەربەرەکانێکردن و تەفروتووناکردنیان، رێی ئەوەی نەداوە کە دوو کتێبە پیرۆزەکەیان کە بە زاراوایەکی تێکەڵ لە زاراوای موکریانی ـ سلێمانی ـ ئەردەڵان ـ بادینان نووسراوەتەوە، ببنە کتێبی پیرۆز و بنکەی ئاینێکی گشتی بۆ کورد و خەڵکی کوردستان.

هەرچەندە لە کوردستاندا و لە دەوری ئیسلامەتیدا گەلێك بزووتنەوەی ئاینانەی پێشکەوتووخوازانە لە سەر بنچینەی ئاینە کۆنەکانی کورد و بە نیازی ئاسانکردن و رێکخستنی ئاینی ئیسلام،روویان داوە؛ وەك ئاینی (ئەهلی هەق) (١٣) و ئاینی (شەبەك) (١٤) لەگەڵ ئەوەشدا کتێبە پیرۆزەکانیان بە کوردی نەبوون و ئاینە کەشیان نەیتوانیوە بە نێو هەموو گەلی کورددا بڵاو ببێتەوە. هەروەها ئەو پیاوە ئاینی یە

گەورانەی تا ئێستە لە نێو کورددا هەڵکەوتوون و بنچینەی تەریقەتیان دامەزراندووە، یا پێشەوایی یان کردووە؛ وەك شێخ عەبدولقادری گەیلانی (١٠٧٧ ـ ١١٦٦) (١٥) و مەولانا خالیدی نەقشبەندی (١٧٧٩ ـ ١٨٢٦) (١٦) وحاجی کاك ئەحمەد (١٧٩٣ ـ ١٨٨٧) (١٧) ولەم دواییەشدا سەعیدی نوورسی (١٨٧٣؟ ـ ١٩٦٠) (١٨)؛ هیچیان نەیانتوانیوە هەموو گەلی کورد بکەنە لایەنگیری خۆیان و هەروەها هیچیان کتێبێکی بیرۆزیان سەبارەت بە تەریقەت یا بیروباوەری خۆیان بە کوردی بەجێ نە هێشتووە.

بە مانەی سەرەوەدا بۆمان روون دەبێتەوە کە ئاین لە نێو کورددا هیچ جۆرە دەورێکی بنچینەیی ی نەگێڕاوە بۆ دروستکردنی زمانی ئەدەبی.

## (٢)ـ نەبوونی ئەدەبیاتێکی فراوان بە تەنیا شێوەیەکی کوردی

ئەگەرچی کورد تا ئێستە دەوڵەتێکی نێوەندی ی یەکگرتووی نەبووە کە پشتی شێوەیەك لە شێوەکان بگرێ و ئەدەبیات بەو شێوەیە زۆر بکات، بەڵام لە رابوردوودا چەند ئەمارەتێکی سەربەخۆ هاتنە کایەوە[1] کە ئەدەبیاتی کوردی تێیاندا پەرەی سەندووە. جا لەبەر ئەوەی ئەماتە چەند ئەمارەتێکی جیاجیابوون و تەنیا یەك ئەمارەتی یەکگرتوو لە کایەدا نەبووە؛ دیارە لە هەر ئەمارەتێکدا ئەدەبیات بە شێوەیەکی دی گەشەی کردووە. بۆ وێنە: لە ئەمارەتی بۆتاندا بە زاراوای جزیرە و لە ئەمارەتی باباندا بە زاراوای سلەیمانی و لە ئەمارەتی ئەردەڵاندا بە زاراوای هەورامی (گۆرانی). شێوەی گۆرانی؛ لە پاش دروستکردنی شاری سلەیمانی و بە هێز بوونی ئەمارەتی بابان؛ وردە وردە برەوی نەما و زاراوای سلەیمانی جێ ی پێ لەق کرد. بەڵام نە زاراوای جزیرە کاری کردە سەر دانیشتوانی نێوەڕاستو خوارووی کوردستان و نە زاراوای سلەیمانی کاری کردە سەر دانیشتوانی ژووروو ی کوردستان. بە گشتی چونکە ئەدەبیاتی کوردی لە هەردوو ئەمارەتەکەدا لە سنوورێکی فراواندا نەبوو و ڕێ ی بڵاو بوونەوەشی بە نێو خەڵکەکەی ئەمارەتەکەی دیدا ئاسان نەبوو. ئەمجا بە تایبەتی ئەو دەمە چاپ و چاپەمەنی نەبوو، خوێندەواریش یەکجار کەم دەستدەکەوتن؛ لە بەرئەوە لە کورتی بیهێنینەوە: نە خەڵکی خوارووی کوردستان تاموچێژی بەرهەمی هۆنراوەکانی مەلای جزیری و ئەحمەدی خانی و فەقێ تەیران و عەلی حەریری و مەلای باتەیی کرد، یا نووسینەکانی عەلی تەرەماخی و مەلا مەحموودی بایەزیدی بەرچاوکەوت، نە خەڵکی ژووروی کوردستانیش تامی هۆنراوەکانی نالی و کوردی و ئالەبانی و کۆیی یان کرد. لە بەر ئەوە ئەدەبیاتیش هیچ دەورێکی نەگێڕا لە سەپاندن و چەسپاندنی شێوەیەك لە شێوەکاندا.

## (٣)ـ نەبوونی خوێندنگە و زانستگە و رۆژنامەی کوردی

ئەوەی لە هەمووان ئاشکرایە ئەوەیە کە لە کوردستاندا هیچ کاتێك زانستگە و قوتابخانەی کوردی تا پاش جەنگی جیهانی ی یەکەم نەبووە. کتێبی زانستی و و رۆژنامەی زۆر و زەبەندەی وا کە خزمەتی شێوەیەك لە شێوەکان بکا و بڵاو بیکاتەوە؛ نە ئەوکاتە هەبووە و نە ئێستەش. بەڵێ لە کوردستاندا قوتابخانە و خوێندنگەی ئاینی بووە و هەیە، بەڵام ئەو خوێندنگەیانە بۆ خزمەتی زمان و ئەدەبیاتی کوردی نە بوون و نین. هەرچەندە ئەو دەرزانەی لە مزگەوتەکاندا خوێندراون؛ بە کوردی لێکدراونەتەوە، بەڵام ئەمە تەنیا بۆ تێگەیاندن بووە، نەك بۆ خزمەتی زمانی کوردی. لەبەر ئەوە هەر مامۆستایە ئەو کوردی یەی بەکارهێناوە کە لە ماڵەوە قسەی پێکردووە. ئەوەتا عەلی تەرەماخی دەستووری زمانی عەرەبی بە کرمانجی ی ژووروو نووسیوەتەوە؛ بۆ ئەوەی

شاگردەکانی باشترعەرەبی فێرببن (١٩) . شێخ مارفی نۆدێ ( ١٧٥٣ ــ ١٨٣٨ ) ش وەك خۆی دانی پێدا دەنێ ؛ فەرهەنگۆکی عەرەبی ــ کوردی (( ئەحمەدی )) ــ کە بە زاراوای سلەیمانی یە ــ بۆیە نووسیوەتەوە کە ئەحمەدی کوڕی بە هاسانی فێری زمانی عەرەبی ببێ ( ٢٠ ) . لەبەر ئەمانە هەمووی؛ قوتابخانە و خوێندنگەکانی کوردستان دەوریان نەبووە لە دروستکردنی زمانی ئەدەبی ی کوردی دا .

## (٤)- نالەباری ژینی کۆمەڵایەتی

ژینی کۆمەڵایەتی ؛ بەتایبەتی پێوەندیی بازرگانی و ئابووری ، هیچ کاتێك لە رادەیەکدا نەبووە کە لە کوردستاندا شاری گەورەی وا ببێ ببنە ناوچەی پیشەسازی و بازرگانی ، یا پێتەختی هەموو لایەکی وڵاتەکە . تا ئێستەش کورد شاری گەورەی لە جۆری نێوبراونی یە . هاتوچۆ لە بەینی پارچەکانی کوردستاندا پێش جەنگی جیهانی ی یەکەم زۆر کەم بووە؛ بە هۆی نەبوونی ئەو پێوەندی یە بازرگانی یە بەهێزە و سەختی و نائەمینی ی رێ وە . دیارە پاش جەنگی جیهانی ی یەکەمیش ،واتا دابەشکردنەوەی کوردستان بەم جۆرەی ئەمڕۆی ؛ ئەو هاتوچۆکردنە بە شێوەیەکی رەسمی لە لایەن دەوڵەتە دابەشکەرەکانەوە رێی لێگیراوە .

<u>بەمانەی سەرەوەدا بۆمان دەرکەوت ؛ ئەو هۆیانەی کەوا لە شێوەیەك دەکەن لە خۆیەوە و لە سەرخۆ ببێتە زمانێکی ئەدەبی ، بە درێژایی ی مێژوو بۆ کورد هەڵنەکەوتوون .</u>

## ج- هەوڵدانێکی ڕێکخراوی زانستانەی لەسەرخۆ بۆ بەرهەم هێنانی زمانێکی ئەدەبی

ئەم رێیە ئەو گەلانە دەیگرن کە هەردوو رێی باسکراوی پێشوویان بۆ دەست نادا . بە بیروڕای من ئەمەیان باشترین و تەنیا رێیەکە کە کورد بتوانێ پێیدا بڕوا لەم بارەیەوە . واتا ئێمە دەبێ شێوەیەکی ئەدەبی بۆ خۆمان دروستبکەین . بەڵام ئایا دروستکردنی ئەم شێوەیە لە کوێوە دەست پێ بکا و کێ دەستی پێ بکا و چۆن دەست پێ بکرێ ؛ ئەوە پێویستی بە شیکردنەوە و لە سەرڕۆیشتن هەیە .

## ٣- سەرنجێکی سەرپێی لە هێندێ بیروڕای چەوت

بەرلەوەی باس لە دروستکردنی زمانی ئەدەبی ی وردی بکەم ، دەمەوێ ئەوە بخەمە بەرچاو کە هێندێ کەس هەن دەڵێن گوایە با واز لە شێوەکانی کوردی بهێنین ، هەریەکە بۆخۆی پێی بنووسرێتەوە و پێی بخوێنرێتەوە و ئیتر پێویست بە زمانێکی ئەدەبی ی یەکگرتوو ناکا . ئەم بیرە لە نێو کورددا بۆ یەکەمجار عیسمەت شەریف هانیە پێشەوە (٢١) . ئەمەش لە ئەنجامی هەستێکی تەسکوتروسکی ناوچەپەرستانە و وردە بۆرجوازیانەوە سەریانکێشایە دەرەوە . جا لەبەر ئەوەی عیسمەت شەریف خۆی هـ ـۆرە شێوەیەکی کوردی نازانێ ، هەروەها لە هیچ زانستگە و ئامۆژگایەك تییێت ـنەوانی نەخوێندووە ؛ دیارە قسەکانی جێی بایەخ نین و لەسەر ڕۆیشتنی هەرکات بەفیڕۆ ـنە. تەنیا

ئەوە نەبێ کە بڵێم: پێویستە هەموو کوردێك کە بە تەنگ پاشەڕۆژی زمان و نەتەوەکەیەوە دێ، بە هەموو هێزێکیەوە بەربەرەکانێی ئەم بیرە زرکە پووچەڵە بکا کە لە خزمەتی دوژمنانی کورد و داگیرکەرانی وڵاتەکەی بەولاوە، خزمەتی هیچ جۆرە ئامانجێکی دی ناکا.

هەروەها ئەو رایەی دوکتۆر کەمال فوئادیش بەراست نازانم کە دەڵێ ''لە دوو شێوەی کرمانجیی ژووروو و کرمانجیی نێوەڕاست (یا کرمانجیی رۆژهەلات و کرمانجیی رۆژاوا)، یەکێکیان بکەینە شێوەی ئەدەبی و وازلەوی دی‌یان بهێنین''. ئەو شێوەیەی کە دەکرێتە شێوەی ئەدەبی، بە قسەی ئەو، دەبێ ئەوەیان بێ (کە فێربوونی هاسان بێ و زۆر شتی پێ نووسرابێتەوە) (٢٢).

جارێ ئەگەر مەسەلەکە مەسەلەی گرانی و هاسانی بێ، ئەوا هەردوو شێوەکە لای گرانیان تێدایە و لای هاسانیشیان تێدایە. هێندێ دەستووری رێزمان هەن، لەم لا گرانن و لەو لا هاسانن و پێچەوانەش بە پێچەوانە. خۆ ئەگەر مەسەلەش ئەوە بێ، بەکام لا زۆرتر نووسراوە، ئەوە هەڵبژێرین، ئەوا بە هەردوو لا شت وەك یەك نووسراوە. هەردوولاش نووسەر و هۆنەری بەرز و نزمیان تێدا هەڵکەوتووە. لە بەر ئەوە هەڵبژاردنی شێوەیەکی ئەدەبی لەسەر ئەو بنچینانەی ئەو باسی کردووە، بۆ زمانی کوردی دەست نادا. چونکە ئەمەش لە ئەنجامدا هەر رێی سەپاندنی شێوەیەکە بەسەر خەڵکی دا کە وەك باسمانکرد ئەو رێ یە بۆ کورد سەر ناگرێ.

هەر لێرەدا بە پێویستی دەزانم قسەیەکیش لە بارەی ئەوانەوە بکەم کە بەرامبەر زمانی ئەدەبیی کوردی بیروڕایەکی نەختێك بەرچاوتەنگانە پێشان دەدەن. پوختەی ئەمەش ئەوەیە: نابێ هیچ نووسین و پرۆگرامێکی رادیۆ بە زاراوای بادینان یا زاراوایەکی دی ببێ، بێجگە لە زاراوای سلێمانی کە ئەمڕۆ بۆ نووسین تا ئەندازەیەك لە عێراقدا ـ ئەویش نەك لە لایەن هەموو کوردێکەوە ـ پێڕەوی دەکرێ. بۆ وێنە: کاك محەممەدی مەلا کەریم لە شوێنێکدا نووسیبووی، گوایە ((پاش شۆڕشی چواردەی تەمووز و هەر لە بەرەبەیانی شۆڕشەوە هەندێ لە رۆشن بیرە نیشتمان پەروەرەکانی کورد کە دەستیان لە ئێسگەی کوردیی بەغدادا هەبوو بە نیازێکی پاك کەوتنە هەڵەیەکەوە. ئەرکی ئەو هەڵەیە پاشان بە گران لەسەر نەتەوەی کورد تەواو بوو. ئەو هەڵەیە نووسین و بڵاوکردنەوە بوو بە شێوەی کرمانجیی سەروو کە ناوی لێ نراوە (بادینانی)... لە چواردەی تەممووزەوە ئێسگەی کوردیی بەغدا لە راستیدا بووە بە دوو ئێسگەی سۆرانی و بادینانی ...هتد)) (٢٣).

هەرچەندە پێم وایە ئەم ((هەڵە)) یە هەڵەی ((هەندێ لە رۆشن بیرە نیشتمان پەروەرەکانی کورد)) نە بووکە ((بە نیازێکی پاك)) تێی کەوتبن، بەڵکو دانانی ((پرۆگرامی بادینانی)) لە رادیۆی بەغدادا بە پێی نەخشەیەکی سیاسی تایبەتی بوو، دارو دەستەی قاسم بە پشتیوانی هێندێ کوردی هەلپەرست هێنایانە کایەوە و لەگەڵ ئەوەشدا کە ئەم بیروڕایەی کاك محەممەد شتێکی تازە کۆنیە و رای ئەو رۆژەی ئەوسای نەبوو کە خۆی یەکێك بوو لەوانەی لە رادیۆوە قسەیان دەکرد و لە وێستگەدا دەستیان دەڕۆیشت... هێشتا بە شێبە حاڵی خۆم، ئەوە بە هەڵە نازانم، پیاو لە رادیۆدا، رۆژی بۆ ماوەیەك بە زاراوای ناوچەکان قسە بکات، بە تایبەتی بۆ ئەوانەی نەخوێندەوارن. لە وڵاتە پێشکەوتووەکاندا، نەك تەنیا لە رادیۆدا، بەڵکو لەسەر شانۆش بە زاراوای ناوچەیی قسە دەکرێ و کەسیش ترسی ئەوەی لێ نە نیشتووە بەوە زمانە ئەدەبی یەکەی لە دەست بچێ. مرۆڤی وتوو وریا و تێگەیشتوو و رۆشنبیر و بەتەنگەوەهاتووش

ئەوەیە بزانێ چۆن کەڵک لە نەخشەی ماڵوێرانکەرانەی دوژمنەکانی وەردەگرێ بۆ خزمەتی ئامانجەکانی گەلەکەی خۆی. بۆ وێنە: ئەگەر هاتوو دوژمن بە نیازی دووبەرەکی و سێ بەرەکی نانەوە، یا لەتوپەتکردنی زمانەکەت، پرۆگرامی بە چەند زاراوەیەکی ناوچەیی سەپاند بەسەرتا، تۆ دەبێ هەوڵ بدەیت، بوونی ئەو زاراوانە لە رادیۆدا بۆ بڵاوکردنەوە و خزمە تکردنی زمانە ئەدەبی یەکەتبە کاربهێنیت، بە تایبەتی لەو ناوچانەدا کە بەو زاراوانە قسە دەکرێن. نەك ئەوەی ئەوکاتە هیچتەکرد بێت و پاش (١٥) ساڵ، لە بەکارهێنانی زاراوەیەکی تایبەتی ترست لێ بنیشێ و ئوباڵەکەی بنێیتە ملی "رۆشنبیری نیشتمان پەروەر". رۆشنبیری راست نابێتە کوتەکی دەستی دیکتاتۆر و زۆردار.

## ٤- لە کوێوە دەست پێ بکرێ و کێ پێی بکا؟

لە وەرامی ئەوەدا کە لە کوێوە دەست پێ بکەین، بێ سێ و دوو دەڵێم: دەبێ لە کوردستانی عێراقەوە دەست پێ بکەین. چونکە ئەمڕۆ لە کوردستانی تورکیا و ئێران و سووریادا خزمە تکردنی زمانی کوردی بە تاوانباری دەژمێررێ. دەمێنێتەوە سەر کوردەکانی یەکێتیی سۆڤیێت کە هەرچەندە تا ئەندازەیەك خەریکی زمانی کوردی بوون (ئەویش بەزۆری تەنیا زاراوەیەکی شێوەی کرمانجیی ژوورو)، بەڵام ئەوانیش هەتا ئێستە لەم بارەیەوە هیچ هەنگاوێکیان نەناوە. بێجگە لەوەش ئەو دەسەڵاتەی لە کوردستانی عێراقدا هەیە، لەوێ چنگناکەوێ. لەمەش بترازێ ئەمە ماوەیە کە زانا کوردەکانی سۆڤیێت لەگەڵ زانا کوردەکانی عێراقدا بوونەتە ئاشنا و لە داوودەزگاکانی کوردیی عێراقدا هاوبەشن. کە دەڵێم کوردستانی عێراق ببێتە جێی دەست پێکردن، چونکە تەنیا شوێنێکی کوردستانە کە ژمارەیەکی زۆر داوودەزگای زانەوانی و هونەروەری لێیە: زانستگەیەکی لێیە کە بە هیوایین بۆ پاشەڕۆژ ببێتە زانستگەیەکی کوردی، بنکەی ((کۆڕی زانیاریی کورد)) لەوێیە، لە قوتابخانەکاندا بە کوردی دەخوێنرێ، چەند رۆژنامە و گۆڤارێکی کوردی لێ دەردەچێ، پرۆگرامە کوردییەکانی رادیۆ و تەلەفزیۆنی عێراق، ماوەیان پترە لە هی شوێنەکانی دی. لەوەش بترازێ کوردی هەموو جۆرە شێوەیەکی لێ دەست دەکەوێ... کوردی عێراق سەربەستتر و دەستڕۆیشتووترن لە هەموو کوردەکانی دی جیهان. لەبەر ئەوە کوردی عێراق دەتوانن ئەوەی ئامادە دەکرێ و بڕیاری لەسەر دەدرێ کەموزۆر بیخەنە مەیدانی کارەوە و هەر لە سەر قاقەز نەیهێڵنەوە. بەڵام ئایە کێ ئەمە بکا؟ (٢٤)

لە وەرامدا دەڵێم: ئەوانەی کاربەدەستن، واتا ئەوانەی داوودەزگای سیاسی و زانەوانی و هونەری و خوێندەواری و رۆشنبیری یان بەدەستەوەیە. بە کورتی حیزبە سیاسییەکان و کۆمەڵە رۆشنبیری و هونەرییەکان و بەڕێوەبەرێتیی خوێندەواریی کوردی و سەرۆکایەتیی زانستگەی سلەیمانی و بەشی کوردیی زانستگەی بەغدا و یەکێتیی نووسەرانی کورد و لە پێش هەموویانەوە ((کۆڕی زانیاریی کورد)). کە دەڵێم لە پێش هەموویانەوە ((کۆڕی زانیاریی کورد))، لەبەر ئەوەیە کە ئەم جۆرە کۆڕانە لە هەر وڵاتێکدا بن، گەورەترین دەسەڵاتێکی زانستانەن بۆ بڵاوکردنەوە و چەسپکردنی هەموو جۆرە دانان و گۆڕین و چارەسەرکردنێك لە بارەی زمانەوە. بەڵام ئەو پرسیارەی لێرەدا دێتە گۆڕێ ئەوەیە، ئایە ئەم کۆمەڵەی لە عێراق دامەزراوە بە ناوی ((کۆڕی زانیاریی کورد))، وە و بەم شێوەیەی ئێستەی، ئەم فرمانە پیرۆزەی پێ دەچێ بەڕێوە یان نا؟ ئەوە دیارە دەبێ کە مێك لێی بدوێین.

## ٥- تێکۆشانێک لە رابوردوودا

ئەز بەشبەحاڵی خۆم، هەر لە کۆنەوە هەستم بەوە کردووە کە خزمەتی راستەقینەی زمان لە رێی کۆڕێکی زمانەوانییەوە دەکرێ. جا لێرەدا زۆرم پێ ناخۆشە کە وا ناچارم چیرۆکێک بگێڕمەوە کە باسی خۆمی تێدایە. بەڵام چی بکەم! ئەو باسە بەشێکە لە مێژووی زمانەوانیی کورد. لەبەر ئەوە لێرەدا هەر ئەوەندە دەڵێم: بۆ گەیشتن بەم ئامانجە، بیست و دوو ساڵ لەمەوبەر، واتا لە ساڵی ١٩٥٢ ـ ١٩٥٣ دا لەگەڵ چەند هاورێیەک کە ئەو دەمە هەموومان خوێندکار بووین لە زانستگەی بەغدا، قسەم کرد و لە ئەنجامدا کۆمەڵێکمان بۆ ئەم ئیشە پێکەوەنا. ئامانجی من لەم کارە بەزۆری ئەوە بوو کە زاراوە زانستییەکانی فیزیک وکیمیا و ماتماتیک وگیانەوەرناسی و رێزمان و ... هتد بکرێنە کوردی؛ بە نیازی نووسینەوەی ئەو زانستانە بە زمانی کوردی.

لە هاوینی ساڵی ١٩٥٣ دا جاوبار بە ئێواران لەگەڵ هێندێک لەو هاورێیانە لە باخی بەرتەکیەی سلێمانی کۆدەبووینەوە و ئەم باسانەمان پێکەوە دەکرد. سەرتان نەیەشێنم! خەڵکی هەستیان بەمە کرد. ژمارەیەک مرۆڤی دووربین و چاوکراوە پشتگیرییان کردین. لەوانە نێوی دووکەسم لەبیرە کە زۆر بە جەرگەوە لە سەر ئەم کارەیان دەکردەوە. یەکێک لەوانە ئاسنگەری بە نێوبانگ وەستا ئەورەحمانی خامە سنەیی بوو و ئەوی دیشیان میرزا عارفی باوکی مامۆستا فایەق عارف بوو. ئەمانە ئێمەیان خۆش دەویست و دەیانگوت ئێوە تێکە پشتوون؛ دەتانەوێ خزمەتی گەلەکەتان بکەن. بەڵام ئەوەی شایانی باسە ئەوەیە ئەم هەنگاوە وەک هەموو هەنگاوێکی شۆڕشگێڕانەی پێشڕەوانە؛ هەموو کەسێک تێی نەدەگەیشت. لەبەر ئەوە زۆر کەس کەوتنە تەقە لێمان. هێندێک لە ساویلکەیەتیی خۆیانەوە دەیانگوت: (( ئەمانە شێت بوون و تێکچوون )) و بە زەییان دەهاتەوە پێماندا. هێندێکی دیش دەیانگوت: (( نەخێر ئیستیعمار رای سپاردوون ئەمە بکەن )). وەکو ئیستیعمار هیچ ئیشوکاری نەبێ لە خزمەتکردنی کورد بەولاوە. هێندێ ووردە بۆرجوازیی خۆبەڕۆشنبیرزانی لە خۆبایی بوو یشبەپێکەنینێکەوە دەیانگوت: (( نە بابە ئەمانە چەند منداڵێکی شۆڤێنی و بێ ئەقڵن و دووای کڵاوی بابردووکەوتوون. ئەگینا کوردی کەی زمانێکە کە کیمیا و فیزیک و جەبری پێ بنووسرێتەوە. وا گریمان نووسرایشەوە، کێ دەیکڕێ و کێ دەیخوێنێتەوە )). دیارە ئەم قسەیە ئەگەر بە تەرازووی لێکدانەوەی ئەوانە بیکێشیتکە بە چاوێکی بازرگانانەوە دەڕواننە مەسەلەکە، هیچ درۆی تێدا نەبوو. چونکە زمانی کوردی ئەو رۆژە زمانی نان پەیداکردن نەبوو. خۆ خەریک کردنیش بە شتێکەوە کە نانی تێدا نەبێ، دیارە بە پێی بۆچوونی ئەو جۆرە کەسانە ((کەرێتی)) یە. ئێمەیش ئەو دەمە، چەند لاوێکی نەناسراو بووین کە تازە لە زانستگەی بەغدا دەمانخوێند. هیچمان تەمەنی لە بیست ساڵ تێپەڕی نەدەکرد. لەبەر ئەوە بووبووینە ماڵی بێ دان و لە هەموو لایەکەوە درابووینە بەرکڵکان و هێرش دەبرایە سەرمان. بەڵام دیارە ئێمە بەم قسانە پەست نەدەبووین و ــ هەموو جارێ کە گاڵتەمان پێ دەکرا، ئەو ئایەتەمان دەهاتەوە بیر کە دەڵێ: (( فإنْ تَسخروا مِنّا فإنّا نَسخرُ منكم كما تَسخَرُون )).

لە کورتیی بێڕمەوە: کۆمەڵەکە لەبەر گەلێک هۆ زۆر نەژیا. بەڵام ئەز هەر وازم نەهێنا و ئەوە بوو کە لە ئۆکتۆبەری ساڵی ١٩٥٥ دا کرام بە مامۆستای فیزیک و ماتماتیک لە قوتابخانە ناوەندییەکانی کەرکووک؛ دەستم کرد بە

نووسینەوەی زنجیرەیەك كتێبی جەبر و فیزیك بە كوردی و ژمارەیەكی یەكجار زۆر زاراوەی زانستیم بە كوردی داهێنا و گەلێك لەو زاراوەیانەی دروستم كرد بوون لەوانەدا بەكارم هێنان ، لە سالی (١٩٥٦) دا دوو بەرگم بە ناوی ((سەرەتای جەبر)) ەوە بە رۆنیۆ لە كەركووك لە چاپ دا .

جا هەرچەندە ئەم كارانەم بە تەنیا دەكرد ، بەلام هەمیشە لەسەر ئەو باوەڕە بووم كە كارێكی وا هەر بە كۆڕێكی زمانەوانی ی ئەوتۆ دەكرێ كە زانا كوردەكانی هەموو لایەكی تێدا كۆ بووبێتەوە . لەبەر ئەوە كە لە هاوینی سالی ١٩٥٦ دا بۆ هێندێ كاروبار ی سیاسی چووم بۆ شام و لوبنان ، لە وێ هەلم بۆ هەلكەوت و چاوم بە هێندێك لە كوردەكانی ئەوێ ، وەك عوسمان سەبری و رەوشەن بەدرخان و قەدری جان كەوت و بەرێكەوت ئەو دەمە هاوڕێی منالیم دوكتور عیزەددین مستەفا رەسووڵ و ئەورەحمانی زەبیحیش لە وێ بوون . ئەم باسەم لەگەلێ هەموویان كردەوە . جا ئەگەرچی زۆربەی زۆری باسەكە ئاڕاستەی ئەوە كرابوو كە جارێ با بەر لە هەموو شتێك نووسینێكی لاتینی ی یەكگرتوو بۆ زمانی كوردی دابنرێ ، ئەوجا خەریكی كێشەكانی دی ببین ، بەلام مەسەلەكە بەسترابوو بە دامەزراندنی ئەكادیمیەكی زمانەوانی یەوە .

كە پشووی هاوینی ئەو سالە بڕایەوە گەڕامەوە كەركووك و دەستم كردەوە بە كار و لە هاوینی سالی ١٩٥٧ دا نامیلكەیەكم لە چاپ دا بۆ بلاوكردنەوەی نووسینی كوردی بە لاتینی . لە وێدا بیروڕای عوسمان سەبری و خۆمم لە بارەی ((كۆڕی زانستی ی كورد)) ەوە بە كورتی نووسی (٢٥) . هەر لە سالی ١٩٥٧ دا نامیلكەی ((خوێندەواری بە زمانی كوردی)) م لە چاپ دا و باسی ((كۆڕی زانستی زمانەوانی ی كورد)) م بە شێوەیەكی باشتر و دوورودرێژتر خستە بەرچاو (٢٦) .

ئەم چالاكی و كاركردنە سەرومڕە ، كاربەدەستانی كۆنەپەرستی ئەوحەلەی كەركووكی ووریا كردەوە و كەوتنە بەربەرەكانێ و بوونە دوژمن لێم . چەند جارێك بە هەڕەشەوە ئاگادار كرام كە نابێ لە ژووری قوتابخانەدا بە هیچ جۆرێ بە كوردی قسە بكرێ و بە كوردی دەرس ووترێتەوە ، چونكە زمانی كوردی زمانی رەسمی نی یە . جا لەبەر ئەوەی گوێڕایەلیم نەكرد ؛ لە ئۆكتۆبەری ١٩٥٧ دا بە فەرمانی وەزارەتی زانیاری (ژمارە ٤٣٣٤٠ ، ٩/ ١٠/ ١٩٥٧) دوورخرامەوە بۆ قوتابخانەی نێوەندی ی زوبێر لە بەسرە ، بۆ ئەوەی پێوەندیم بە كوردستانەوە بپچڕێ . راستی یەكەی هەرچەندە پێوەندیم بڕا بەلام من ئەم هەلی دووركەوتنەوەیەم لە وولات بۆ ئەوە بە كارهێنا كە لە ناوچەی كشوماتی ئەو دەمەی زوبێر و لە نێو خەلكی رووخۆش و بەرچاوتێر و مێوانپەرستی بەسرەدا ؛ ئەو باسانەی گەلالەم كرد بوون ، رێكوپێكیان بكەم و بۆ بلاوكردنەوە ئامادەیان بكەم .

تە قینەوەی كوتوپڕەكەی شۆڕشی چواردەی گەلاوێژ ، هەلێكی یەكجار باشی بۆ كوردی عێراق بە تایبەتی و كوردی هەموو جیهان بە گشتی هێنایە پێشەوە . بەلام نەبوونی داوودەزگایەكی نەتەوەیی ی شۆڕشگێڕانەی پێشكەوتنخواز لە كوردستاندا ، رێی بۆ ئەوە كردەوە كە دەرەبەگ و كۆنەپەرست و وردە بۆرجوازی و فەریكە ماركسی و زركە سۆسیالیست و داگیركەرپەرست ، بكەونە فشە كوردایەتی كردن و رێ لە كوردایەتی راستەقینە بگرن ونەیەلن گەلی كورد سوودێكی وای دەستكەوێ ؛ پێی بلێ ئۆخەی . ئەوی راستی بێ ، هەر لە یەكەمین رۆژی شۆڕشەوە هەستم بە بەرپرسیاری ی خۆم كرد و دەستوبرد پێوەندیم بە هێندێ لە هاوڕێ مامۆستایانەی جارانمەوە بەستەوە و پاش چەند

رۆژێکی کەم، پێکەوە بیرخەرەوەیەکمان دا بە وەزیری زانیاریی ئەودەمە کە دوکتۆر جابر عومەر بوو و داوای دامەزراندنی بەڕێوەبەرێتی یەکانی کورد بە ناوی ((بەڕێوەبەرێتیی زانیاریی کوردستان)) ەوە. هەروەها داوای ئەوەمان کرد کە خوێندن لە هەموو پلەیەکی قوتابخانەکاندا بکرێ بە زمانی کوردی و لە زانستگەی بەغدادیشدا بەشێك بۆ کوردەوانی دابنرێ و کۆڕێکی زمانەوانی رێکبخرێ و بەڕێوەبەرێتیی زانیاریی کوردستان بهێنرێتە کەرکووك و ... هتد.

بیرخەرەوەکەم لەگەڵ خۆم برد بۆ بەغدا و هەر ئەو رۆژەی گەیشتمە ئەوێ؛ بۆ ئێوارە لە بەشی کوردیی وێستگەی رادیۆی بەغدادا بە یارمەتیی هاوڕێم دوکتۆر عیززەددین مستەفا رەسووڵ، کە لەوێ کاری دەکرد؛ تۆمار کرد و بۆ سبەینێ خوێنرایەوە و هەروەها توانیم لە رۆژنامەی ((البلاد)) یشدا بڵاوی بکەمەوە. ئەم هەواڵە لە کوردستاندا دەنگی دایەوە و جەماوەرانی کوردستان بە زوویەکی زوو دڵیان بۆ ئەم بیرە تازەیا کردەوە و لە هەموو لایەکەوە بە بروسکە پشتگیری کرا و بوو بە داخوازییەکی گشتی. بەڵام هێندێك لەوانەی کە خۆیان بە سەرکردەی کورد دەزانی؛ لە جێی پشتگیری و یارمەتی دان کەوتنە جنێو و هێرش و بەربەرەکانێ. بە تایبەتی چونکە پێی یان ناخۆش بوو، ئەم کارە خۆیان نەیکەن و چەند کەسێکی دی کە ئەودەمە لە هیچ داوودەزگا و حیزبێکدا نەبوون، بە بێ پرسی ئەو ئاغایانە یەك بگرن و بیکەن و گەلیش پشتیوانی یان بکا. هێرشی ئەمانە گەیشتە ئەوپەڕی توند و تیژی؛ کاتێك کە عەبدولسەلام عارفی وەزیری نێوخۆی ئەو کاتە رۆژنامەی ((البلاد)) ی لەسەر بڵاوکردنەوەی ئەو بیرخەرەوەیە داخست. یەکێك لەوانەی کە زۆر هێرشی ناشیرینی دەبردە سەرمان؛ بە داخەوە کاك برایم ئەحمەدی پارێزەر بوو. کاك برایم بە سەرزاری وای دەردەبڕی کە گوایە ((رۆژ رۆژی ئەوە نی یە پیاو ئەو داخوازییانە بە رۆژنامە بڵاو بکاتەوە. چونکە دوکتۆر جابر عومەر و عەبدولسەلام عارف پێی توورە دەبن و دەڵێن ئەمە گێرەشێوێنی یە و جاری کاتی ئەوە نی یە. جا ئەگەر پیاو دڵی ئەوانە بیەشێنێ ئەوا ئیشەکە هەر سەر ناگرێ)).

راستی یەکەی؛ کاك برایم هەرچەندە بەزۆری لەوە بەست بوو کە ئیشەکە خۆی دەستی تێیدا نەبوو، بەڵام هەر لەو کاتەشدا مەسەلەکەی بەستبوو بە هاتوچۆ و دڵ ڕاگرتنی ئەم وەزیر و ئەو وەزیرەوە، نەك بەوەوە کە بیرەکە بخرێتە نێو گەلەوە و کۆمەڵانی خەڵك رێکبخرێن بۆ داواکردن و لەسەر هەڵدان و شوێن کەوتنی.

بە کورتی: گەلێك هۆ کە لێرەدا جێی باسکردنیان نابێتەوە، بالیان بە ئاسمانەوە نا کە داخوازییەکانی کورد، بە تایبەتی دامەزراندنی ((کۆڕی زانستی)) و ((بەڕێوەبەرێتیی گشتیی زانیاریی کوردستان)) بخاتە پشت گوێ و لە جیاتی ئەمانە بەڕێوەبەرێتی یەك بە ناوی ((دیراساتی کوردی)) یەوە لە بەغداد دابنێ؛ کە ئەویش هیچ دەورێکی نەبوو لە پێشخستن و تەووژم پێدانی رۆشنبیریی کورد دا.

جا هەرچەندە ئەودەمە لە قوتابخانە نێوەندی یەکاندا زمانی کوردی بۆ خوێندن بەکارنەدەهێنرا؛ بەڵام هەر هیوام نەبڕی و لە ساڵی ١٩٦٠ دا بەرگێك فیزیکم بە ناوی ((سەرەتای میکانیك و خۆماڵەکانی ماددە)) وە لە چاپ دا، کە لە کاتی خۆی دا (واتا لە ساڵی ١٩٥٦ دا) لە کەرکووك نووسیبوومەوە. ئەو کتێبە یەکەمین کتێبێکی زانستە کە بە زمانی کوردی نووسرابێتەوە. ئەو فەرهەنگۆکە کوردی ـ عەرەبی ـ ئینگلیزی یەی کە کراوەتە پێشکۆی کتێبەکە، یەکەمین فەرهەنگۆکی زاراوەی کوردی یە. ئەوەی شایانی باسە لێرەدا ئەوەیە کە هەر لەو ساڵەدا نامیلکەیەکم بە ناوی ((هێندێ زاراوەی

زانستی )) یەوە لە سلەیمانی بە چاپ گەیاند وکە لە ساڵی ١٩٦٠ – ١٩٦١ یشدا لە قوتابخانەی نێوەندی ی جەعفەری یەی بەغداوە گوێزرامەوە بۆ قوتابخانەی نێوەندی ی هێ و لێر، بە یارمەتی ی هاوڕێم مامۆستا مەلا حەمید ئیسماعیل ؛ لیژنەیەکم بۆ پێشخستنی زمان و ئەدەبیاتی کوردی دامەزراند و دەرزە کوردی یەکانی قوتابخانەی مامۆستایانی سەرەتایی ی هەولێریشم گرتە دەست و بێجگە لەو دەرزانەی کە لەوێ دەمووتنەوە و بە ڕۆنیۆ بۆ قوتابی یەکانم چاپ دەکرد ، هەر لە ساڵی ١٩٦١ دا (( فەرهەنگۆکی زانستی ))م بۆ لە چاپ دان. ئەو فەرهەنگۆکە ژمارەیەکی زۆری ئەو زاراوە زانستی یانەی تێدایە کە ئێستە لە کتێبەکانی قوتابخانەکان و بەرهەمی نووسەرەکانماندا بەکاردەهێنرێن .( ٢٧ ).

ئێستەش کە وا پتر لە بیست و دوو ساڵ بەسەر یەکەمین هەوڵداندا بە کردەوە بۆ دامەزراندنی کۆڕی زانستی ی زمانەوانی تێپەڕ دەبێ ، هەر لەسەر ئەو باوەڕە ماوم کە کۆڕی زمانەوانی ی زانستانە، پێویستە لە زمانەوانەکانی هەموو لایەکی کوردستان پێکهاتبێ . کە دەڵێم " زمانەوان "، هەڵبەتە مەبەستم لەوانە نی یە کە بە کوردی یەکی بێ گرێ و گۆڵ دەنووسن ؛ بەڵکو مەبەستم لەو کوردی زانانەیە کە زانستی زمانەوانی یان خوێندووە یا فێری بوون . زمانەوانی زانستێکە بۆ خۆی و هەر کەسێك جوان و ڕەوان بە شێوەیەك لە شێوەکانی زمانی کوردی نووسی، "زمانەوان" نی یە، بەڵکو " زمان زانە " .

## ٦ - زمانەوان و کۆڕی زمانەوانی

زمانەوان ئەو کەسەیە کە زمانی کوردی لە سەر بنچینەی (( زانستی زمانەوانی ی بەراورد کاری )) – علم اللغات المقارن – Comparative Philology و (( زانستی زمانەوانی ی هیندۆ جەرمەنی ی گشتی )) – علم اللغات الهیندوجرمنیة العام – خوێند بێ . جا بۆ ئەوەی لە جۆری پێکهاتن و گۆڕانی زمانی کوردی، لە باری مۆرفۆلۆژی و فۆنۆلۆژی و لێکسیکۆلۆژی و ئۆرتۆگرافی یەوە ( ٢٨ ) بگەین، پێویستە شارەزای زمانە ئێرانی یەکانی کۆن و نێوەڕاست و تازە ببین : وەك زمانی ئاڤێستا ، فارسی ی کۆن، پارتی ، پەهلەوی ، فارسی ی تازە، بەلووچی ، پەشتۆ . هەروەها بنەماڵەی زمانە هیندی یەکان : وەك هیندی ی کۆن ( سانسکریت ) ، هیندی ی نوێ ، ئۆردوو کە بنچە و ڕەچەڵەکیان لە گەڵ زمانە ئێرانی یەکاندا یەکە . شارەزایی یەکی زمانی لاتینی و یۆنانی کۆنیش بۆ ئەم کارە پێویستە . لەوەش بترازێ ، زمانەوانی کورد ؛ دەبێ شارەزایی ی لە مێژوو و ئێتنۆلۆژیا و میتۆلۆژیا ( ئەفسانە ناسی ) گەلەکەدا ببێ ، تا بتوانێ بنجوبناوانی وشەکان بە شێوەیەکی زانستانە، نەك نێوخەڵکانە ( شعبی ) لێك بداتەوە . لە پاڵ ئەمەشدا شارەزایی یەکی کەمو زۆر لەو زمانانەدا کە کاریان کردووەتە سەر زمانی کوردی لە ڕابوردوو و ئەمڕۆدا ، وەك عەرەبی و تورکی و سریانی و ئەرمەنی، زۆر پێویستە . کاتێك کە ئەم پسپۆڕانەمان پێگەیاند ، ئەو جا دەتوانین ڕکێفی زمانی کوردی ؛ وەك زمانەوانێکی شۆڕەسوار بگرین و خزمەتێکی ڕاستەقینەی بکەین .

نووسەری ئەم نامیلکەیە ، وەك کوردێك کە دووانزە ساڵ زیاترە لە زانستگەکانی ئەورووپادا خەریکی خوێندن و لێکۆڵینەوە و دەرزووتنەوەی بابەتی زمانەوانی وگە لێك زانستی دی یە، لەو باوەڕەدایە کە لە (( کۆڕی زانیاری کورد )) دا لە مامۆستا تۆفیق وەهبی

بەولاوە، کە سێکی دی تێدا نی یە کە بە زمانەوان بدرێتە قەڵەم. بەڵێ ئەدیب و کوردی نووس و مێژوونووس و ئاین ناسی تێدایە وهی واشی تێدایە کە بە کوردی تەواو نازانێ بنووسێ (٢٩).

جا کە لێرەدا ئەمە وا ڕەبوراست دەدرکێنم، تەنیا لەبەر ئەوەیە کە جگەرم بۆ حاڵی زمان و گەلەکەمان ژان دەکا. ئەگینا هیچ رك و کینەیەکم لەکەس نی یە و بە تەمای هیچ خەلات و بەرات و خێروبێرێکی، نە "کۆڕی زانیاریی" و نە هیچ لایەکی دیم. لەبەرئەوە ئامانجم لەگەڵ ئامانجی ئەوانەدا یەکناگرێتەوە کە سەری زمان و بنی زمانیان قسەی سووك و توانج گرتنە "کۆڕی زانیاریی" بوو، کە چی پاش ئەوەی کارێکی پچووکیان پێ سپێررا، ئیتر قوروقە پیان لێکرد. بە کورتی: نە بە تەمای "ڕوتبە و نیشان"ی کۆڕم و نە مەبەستیشم خراپەکاری و رووخاندنی "کۆڕ"ە، چونکە ئەوەتە ئاواتی بیستویەك ساڵ لەمەوبەری خۆمە. بەلام، ئەوەی وەك کوردێك، سوورم لەسەری، تەنیا ئەوەیە، ئەوانەی بەراستی زمانەوانن، پێویستە دەستێکیان ببێ لە بڕیاردانەکانی "کۆڕ"دا، بە تایبەتی لەو شتانەدا کە پێوەندیی ڕاستەوخۆیان بە چارەنووس و پاشەڕۆژی زمانەکەوە هەیە. واتا "نان بدرێ بە نانەوا و گۆشتیش بدرێ بە قەساب" و ئەوەش دەبێ تەنیا لەسەر بنچینەی لێوەشاوەیی بێ، نەك خزم خزمێنە و حیزب حیزبێنە و دزە خونچێنە و دیزە بە دەرخۆنە.

تە نیا چاوخشاندنێکی سەرپێی بەو ڕێنووسەدا کە "کۆڕ" بۆ نووسینی کوردی دایناوە و ژمارەیەکی زۆر لەو ووتارانەی لە ژمارەی یەکەمی گۆڤارەکەیاندا و بەتایبەتی زاراوە داهێنراوەکان، دەریدەخەن کە کەموکوڕییەکانی "کۆڕ" لە ئەندازەیەکدا ن پێویستیان بە بیرازکردنێکی بنچینەیی هەیە.

جا ڕەنگە ئێستە یەکێك لێرەدا رابێ (هەستی) و بڵێ: ((دە فەرموو تۆیەك کەوا دەڵێیت دە هەستە بچۆ چاکی بکە)). بەڵام دیارە تەنیا پیاوی نەفام ئەم قسە یە کاری تێدەکا. بێگومان ئەوانەی کاریان بەدەستە و زۆربەی زۆری ئەندامانی "کۆڕ" پێك دێنن، بە قسەی یەکێك یا دووکەسی لە دەرەوە وێستاو کە دەستیان نەبێ لە گۆڕینی بڕیارەکاندا، واز لە کردەوەی خۆیان ناهێنن و ئەو دەمە پیاو ــ وەك کورد دەکە دەڵێ ــ هەردەبێ "سەیر بخوا و زوڕنا لێ بدا". ئەم قسانەم بایی هەوایی نی یە، بەڵکو لە تاقیکردنەوەوە دێ. چونکە ئەوەتە ئەندامەکانی "کۆڕ" کە باسی شتێکیان لەگەڵ دەکەیت لە دەمە تەقە دەسلەمێنەوە و ڕادەکەن و یا کە بە گیرت هێنان، پاکانەت بۆ دەکەن و دەڵێن: "بە خوا خۆ ئێمە ئاگامان لێی نی یە". ئەمجا ئێستە منێك لەم بنی دنیایەوە، لە کوێ ملی ئەو "جنۆکە بەدفەسالە"ی ئەوێ بگرم کە ئەم ئیشە قۆڕانەی بێ پرسی "کۆڕ"ی بە سزمان کردووە!

کە واتە: ئەگەر بمانەوێ زمانێکی یەکگرتووی ئەدەبیمان ببێ، دەبێ جارێ کۆڕێکی زانستانەی زمانەوانیمان ببێ. واتا دەبێ هەوڵ بدرێ ئەم "کۆڕی زانیاریی کورد"ەی ئێستە هەیە، ڕێی ڕاستی خۆی بگرێ، بەو شێوەیەی لەسەرەوە باسمان کرد. "کۆڕ" دەبێ بەر لە هەموو شتێك، ساڵی چەند خوێنکارێکی لێوەشاوە لە دەرچووانی بەشی کوردی زانستگەی بەغدا یا سلەیمانی، بنێرێ بۆ ئەورووپا بۆ خوێندنی ((زانستی زمانەوانیی گشتی)) و خوێندنی ((فیلۆلۆژیای ئێرانەوانی)) تا دەبنە پسپۆڕی زمانەوانیی کوردی (٣٠).

ئێستەش لێرەدا دەمەوێ چەند سەرنجێکی خۆم لە بارەی هێندێ شتەوە کە لە ژمارەی یەکەمی "گۆڤاری کۆڕی زانیاریی کورد"دا بڵاوکرابوونەوە بخەمە بەرچاو. ئەوەش وەك دڵۆپێك لە زەریایەك:

بۆ وێنە: ئەگەر ووتارێك لەسەر تیپی ((ی))ی خستنە پاڵ (اضافة) لە ڕێزمانی کوردیدا نووسرا و کرۆک (جوهر)ی قسەکان هەموو بەشی یەك دوو لاپەڕەی

کورد، نابێ حەفتاو پێنج لاپەڕەی لەسەر ڕەش بکرێتەوە؛ بە جۆرێ کە زۆربەی زۆری قسەکان
پێوەندییان بە بابەتەکەوە نەبێ. زانست ئەوەیە بابەتانە بێ. لادان لە بابەت
نەپێکانی ئامانجی کورەکی (مرکزی) بابەتە. خۆ ئەگەر هاتوو لەسەر "پێشگری: قە".
و "پاشگری: وە" ووتارێک نووسرا؛ ئەوا نابێ کارێکی وابکرێ، ئەگەر شارەزایەک خوێندییەوە؛
بڵێ ئەمە هەمووی دووپاتکردنەوەیە و بە چەند دێڕێک دەووترا. هەروەها نابێ هەڵەی وا
گەورەبکرێ لە چەشنی ئەوەی "حرفی صحیح"ی عەرەبی بە "تیپی دەنگدار"ی کوردی
(بڕوانە ل ٦٩ ل ٢٤٠ ل ٢٤٣) بدرێتە قەڵەم. چونکە ((حرفی صحیح)) و ((حرفی
صامت)) هەردووکیان هەریەکن و بێ دەنگن، لە کاتێکدا ((حرفی علة)) دەنگدارە.
واتا "تیپە بزوێن" و "تیپی دەنگدار" هەردووکیان یەک مانایان هەیە و یەکن. ئەوەی
ببزوێ دەنگدارە و ئەوەی نەبزوێ بێ دەنگە. یا هەڵەی
لەمە زۆر زلتر: وەک ئەوەی بووترێ "ن"ی چاوگی (نون المصدر) لە کوردیدا، ئەم
تیپانەیان پێش دەکەوێ: أ: (وەک: سووتان) ی: (وەک: بڕین) ۆ: (وەک: چوون)
د: (وەک: کردن) ت: (وەک رشتن) ـ بڕوانە ل ٢٥٣. ئاشکرایە "ن"ی چاوگی،
هیچ کاتێک تیپێکی بێ دەنگی (حرف صامت) consonant وەک "د" و "ت"ی
ناکەوێتە پێشەوە. ئەو تیپەی کە پێش "ن"ی چاوگی کەوتووە لە ووشەی ((کردن)) و
((رشتن))دا؛ ئەو تیپە دەنگدارەیە کە بە عەرەبی "الکسرة المختلسة" و بە ئەڵمانی
Murmelvokal و بە کوردیش "بزرۆکە"یان بۆ داناوە (لە بەر ئەوەی بە ئەلفوبێی عەرەبی
نانووسرێ و لە نووسیندا بزر دەبێ). بەڵام کە ئەم دوو ووشەیە بە ئەلفوبێی لاتینی بنووسرێن؛
بەم جۆرە kirdin و riştin ئەوسا بە تەواوی بۆمان دەردەکەوێ کە تیپی پێش
"ن"ەکە "i"یە واتا تیپێکی دەنگدار (بزوێن)ە، نەک تیپی بێ دەنگی
(صامت)ی "د" یا "ت".

ئەمجا ئەگەر هاتوو یەکێک ووتارێک یا نامەیەکی نووسی، سا بە هەر بۆنەیەکەوە دەبێ
با ببێ، نابێ لە بڕێکدا بچێ و چەند رستەیەک بە زاراوەیەکی ناوچەیی (محلی)
تێکەڵ بە نووسینەکەی بکات. ئەمجا ئەگەر کار دابەشکرا لە نێو هاوکارانی کۆڕدا و بە کێکیان کتێبی
((ئاڤێستا))ی بەرکەوت بۆ "لێکۆڵینەوە"، پێویستە ئەوە دیاری بکرێ کە ئەم
لێکۆڵینەوەیە لە چ ڕوویەکەوە یە و بە چ ئامانجێکە. چونکە لێکۆڵینەوە لە
ئاڤێستا ئەوەندە زۆرە لە ژمارە نایە. خۆ ئەگەر ئەم لێکۆڵینەوەیە بۆ ئەوەیە پێوەندیی
زمانی کوردی و ئاڤێستایی پێشان بدرێ؛ ئەوا لێرەدا بە ئاشکرا دەیڵێم ئەو ووتارەی
لە "گۆڤاری کۆڕ"دا بڵاو کرابووەوە بۆ ئەوەی پێوەندیی ڕێزمانی کوردی و ئاڤێستایی
بخاتە ڕوو، نە لێکۆڵینەوەیە لە ئاڤێستا و نە ئەو مەبەسەشی پێکاوە کە بۆی دانراوە.
چونکە یەکەم نووسینە کە خۆی کورتەیەکی هێندێ باسن، کە بە زمانی ئینگلیزی
لەسەر ئاڤێستا بڵاو کراونەتەوە، لەبەر ئەوە ئەو کورتەیەی بە کوردی نووسراوە "وەرگێڕانە" و
"لێکۆڵینەوە" نییە و بێجگە لەوەش، هیچ پێوەندییەکی تازە دۆزراوەی بەینی ڕێزمانی
کوردی و ڕێزمانی ئاڤێستایی پێشان نادا؛ تا ناوی بنرێ "لێکۆڵینەوە".

دوایی لە هەموو شتێک ناشیرینتر ئەوەیە، پیاو بە ڕاست و بە درۆ لە خۆی بایی بێ
و بکەوێتە مەتحی زمانی کوردی و بە زمانێکی یەکجار دەوڵەمەند بیداتە قەڵەم و سواری
هەسپی خەیاڵ ببێ و بەڵگەشی تەنیا ئەوە بێ کە بۆ هەر مانایەک چەندین ووشە
هەن (بڕوانە ل ٤٢٢). ڕاستی یەکەی دەوڵەمەندیی زمان بەوە نییە بۆ تاقە
مانایەک چەند ووشەیەکت ببێ (بۆ وێنە: چیا، کێو، شاخ، کێف)؛ کە چی بۆ هەزاران ووشەی
فیزیک و فەلسەفە و زانستی کۆمەڵایەتی و تەکنیک و ... هتد تاقە ووشەیەکت لێ بچێتە

قاتی ٠ بوونی چەند ووشەیەکی هاومانا، بەرامبەر یەك مانا ، شتێکی خۆڕسکی یە و پێویست بە خۆ هەڵکیشان ناکات ٠ کە گەلێك ئاخری شەڕ بوو و بوو بە چەند هۆز و تیرەیەکی پچڕپچڕەوە و هەر بەشەی بە شێوەیەکی تایبەتی قسەی کرد و زمانێکی ئەدەبی ی یەکگرتووشی نەبوو، دیارە بۆ هێندێ مانا ، لە جیاتی ووشەیەك ، چەند ووشەیەك دروست دەبن ٠ ئەمەش بەڵگەی پچڕپچڕی و یەکنەگرتوویی ی زمانە ، نەك دەوڵەمەندی ی زمان ٠

بە کورتی : "گۆڤاری کۆڕی زانیاریِ کورد "، پێویستە لە هەموو شتێك پتر پەیڕەوی ی دەستووری "نەخت و پوخت" بکا و شوێنێ کلاوی بابردووی "زۆر و بۆر" و خۆ بە زل گرتن نەکەوێ ٠ بەلای منەوە، سەختگیری (تعصب) تاقە هەوێنی پێشکەوتنە ٠ هیچ کارێك بە خاووخلیچکی و خوازەلۆکی ناچێتە سەر ٠ بەڵام ئێمە دەبێ ((سەختگیری ی کوێرانە )) (التعصب الاعمی) لە (( سەختگیری ی بینایانە )) (التعصب الواعی) جیابکەینەوە ٠ یەکەمیان فڕێ بدەین و باوەش بۆ دووەمیان بکەینەوە ، ئەوجا پێش دەکەوین ٠

جا لەبەر ئەوەی هێشتا هەر هیوام بەوە ماوە کە "کۆڕی زانیاریِ کورد "ڕۆژێ لە ڕۆژان هەست بەو بەرپرسیاری یە گەورەیە دەکا کە پێی سپێرراوە ، وا جارێ بەم چەند سەرنجە کورتە دابین دەبم . بە تەمای ئەوەی "کۆڕ" کارێکی وا بکا کە هەموو لایەك متمانەی پێ بکەن و ڕێزی بڕیارەکانی بگرن و هاوکاری ی لەگەڵدا بکەن ٠ چونکە ئەگەر "کۆڕ" خۆشەویستی ی خۆی و زەبری زانستانەی خۆی لەسەر بنچینەی باوەڕ پێکردن بەسەر گەلدا نەسەپێنێ ، ئەوسا کارەکانی هیچ نرخێکیان نابێ و ئەو ووشانەی دروستیشیان دەکا ، وەك ئەوانەی جارانی (( مجمع علمی عراق )) یان لێ دێ کە کاتی خۆی زانا عەرەبەکان بە گاڵتە پێکردنێکەوە دەیانگوت : "میکانیك" بە عەرەبی بووەتە "علم حيل أبي موسى" و "سندویچ "کراوە بە "شاطر و مشطور بينهما کامخ" و "ئیلیپس" (لە ماتماتیکدا ) بووە بە "شلغمی" و "کولتوور" یشیان لێ کردووین بە "قلطور" ٠

## ٧- بەرەو زمانێکی یەکگرتووی ئەدەبی

بەر لە هەموو شتێك دەمەوێ ئەوە بڵێم کە لێرەدا ووشەی ((کوردی )) و ووشەی ((کرمانجی )) هەردووکیان بۆ تاقە یەك مانا بەکاردەهێنم ٠ چونکە بەراستی هەردوو ووشەکە ، چ ((کوردی )) وچ ((کرمانجی )) هەریەکن و ((کرمانجی )) ش وەك ((کوردی )) هەر زمانی کوردی دەگرێتەوە ، بە هەموو شێوە و زاراواکانی یەوە ٠ ئەوەتا خاوەنی "شەرەفنامە" و ئەحمەدی خانی و مەلا مەحموودی بایەزیدی و گەلێك لە زانا و نووسەرەکانی کورد ، هەر لە کۆنەوە ووشەی ((کورد )) و ((کرمانج )) یان هەر بە یەك شتدا ناوە و لە جیاتی یەك بەکاریان هێناون ٠ جا لەبەر ئەوەی خۆم لەسەر ئەو باوەڕەم کە ووشەی ((کرمانجی )) لە ووشەی ((کوردی )) کۆنترە ، بە زۆری لێرەدا ووشەی ((کرمانج )) بەکاردەهێنم و (( زمانی کرمانجیش)) بەسەر دوو شێوەی بنچینەیی و دوو شێوەی لاتەنیشتدا دابەش دەکەم ٠ مەبەستیشم لەم دابەشکردنە بەم جۆرە ، کەم کردنەوەی نرخ وبایەخی ئەو شێوانە نی یە کە بە لاتەنیشتیان دادەنێم ٠ بەڵکو مەبەستم لە شێوە بنچینەیی یەکان ئەو شێوانەیە کە ئەمڕۆ بوونەتە زمانی ئەدەبی و شێوە لاتەنیشتەکانیش ئەوانەن کە دەمێکە ئەو دەورە نابینن ٠ جا لەبەر ئەوەی بە تەمام بەرگێکی تایبەتی بۆ لێکۆڵینەوە لە خۆماڵەکانی زمانی کوردی و شێوەکانی تەرخان بکەم ، نامەوێ لێرەدا بە دوورودرێژی لە هەر یەکێ لەم شێوانە بدوێم ، ئەوەندە نەبێ کە پێوەندی ی بە باسەکەوە هەیە ٠

## أ ـ دوو شێوە بنچینەییەکە

### ١ ـ کرمانجی ژوورو

ئەم شێوەیە زاراواکانی بۆتانی و جزیرەیی و هەکاری و بادینانی و ئاشیتەیی و بایەزیدی دەگرێتەوە کە زاراوای جزیرە بە سەر هەموویاندا زاڵ بووە و خۆی کردووە بە شێوەی ئەدەبیی ئەم کۆمەڵە .

### ٢ ـ کرمانجی نێوەڕاست

ئەم شێوەیەش زاراواکانی سلێمانی و سنەیی ـ ئەردەڵانی و کەرکوکی ـ گەرمیانی و هەولێری ـ سۆرانی و موکری و شارباژێری و پژدەری دەگرێتەوە کە زاراوای سلێمانی بە سەر هەموویاندا زاڵ بووە و خۆی کردووە بە شێوەی ئەدەبیی ئەم کۆمەڵە .

## ب ـ دوو شێوە لاتەنیشتەکە

### ١ ـ کرمانجی ژێروو

ئەمەش زاراواکانی فەیلی و کرماشانی و لەکی و کەڵهوڕی و خانەقینی و هێندێ لەو زاراوانە دەگرێتەوە کە بە شێوەی (( لوڕی )) (٣١) دەدرێنە قەڵەم . بەرزترین شاعیری ئەم شێوەیە باباتایەری هەمەدانی و مەلا پەرێشانی کورد بوون . شایانی باسە کە ئەم شێوەیە وەك شێوەیەکی ئەدەبی ، ماوەیەکی زۆرە دەوری خۆی وون کردووە . کوردە فەیلی یەکانی عێراق ، لە بەغدا بن یا بەدرە یا مەندەلی یا جەسان یا زەرباتی یە یا کووت ، زمانی ئەدەبی یان هەر ئەو کوردی یەیە کە لە کوردستانی عێراقدا بەکاردەهێنرێ . کوردەکانی کرماشانیش هەر ئەو کوردی یە یا نێزیك لەوە بە شێوەی ئەدەبی ی خۆیان دەزانن . بە تایبەتی چونکە لە کوردستانی ئێراندا شێوەی موکری ؛ کە زاراوایەکی کرمانجیی نێوەڕاستە و لە زمانی نووسینی کوردی یەوە نێزیکە ، بە کوردی ی " راستەقینە " دەدرێتە قەڵەم و وێستگەی رادیۆش هەر بەو شێوەیە پرۆگرامەکانی خۆی بڵاو دەکاتەوە .

### ٢ ـ کۆمەڵە شێوەی گۆرانی ـ زازایی

زاراواکانی گۆران ئەو زاراوانەن کە لە هەورامان و ناوچەی زەنگنە و ناوچەی کاکەیی یەکان لە کەرکووك قسەی پێ دەکرێ و بە زمانی "ماچۆ" ـ واتا " دەڵێم " ـ ناوی رۆیوە . زاراوای گۆرانی ، رۆژێ لە رۆژان زمانی رەسمیی میرنشینی ئەردەڵان و تا ماوەیەکیش هی بابان بووە . لە شاعیرە گەورەکانی ئەم شێوەیە ؛ خانای قوبادی و مەولەوی . ئەوەی شایانی باسە ؛ ماوەیەکی زۆرە ئەم شێوەیە دەوری خۆی وەك زمانێکی ئەدەبی لە دەست داوە . نووسەرە کوردەکانی ناوچەی هەورامان و زەنگنە و کاکەیی کە بەم زاراوایە قسەدەکەن ، بۆ نووسین زاراوای سلێمانی ـ سۆرانی بەکاردەبەن .

زاراواکانی زازاش لە ناوچەکانی بین گۆل و ناوچەکانی ئەلەزیز ( دێرسیم ، خەرپووت مەعدن ) و ناوچەکانی دیاربەکر ( قولب ، هێنە ، پیران ، چێرمووك ) و لە ئورفە ( سیوێرەك ) لە لایەن ٢٥٠ هەزار کەسێکەوە قسەیان پێ دەکرێ . زازایی لە گۆرانی یەوە زۆر نێزیکە و لەبەر ئەوەیە کە هەردووکیان بە کۆمەڵە شێوەیەك دادەنرێن . بەلام ئەوە هەیە زازایی هیچ کاتێك شێوەیەکی ئەدەبیی کوردی نەبووە و ئەوانەی بە

زازاییش دەدوون، چونکە لە نێو کرمانجەکانی ژووروی کوردستاندا دەژین؛ بە زۆری بە شێوەی کرمانجیی ژووروو دەپەیڤن (قسە دەکەن) و هەر ئەو شێوەیەش بۆ نووسین بەکاردەبەن. کۆمەڵە شێوەی گۆرانی – زازایی، هەرچەندە تا ئەندازەیەك کەوتووەتە ژێر تاوی فارسیی نێوەڕاستەوە، بەڵام هێشتا شوێنەواری زۆر کۆنی پێوەماوە و هەڵ دەگرێ خەریکی ببین و زمانە ئەدەبییەکمان بە ووشەو ووتە ڕەسەنەکانی دەوڵەمەندتر بکەین.

بەمانەی سەرەوەدا بۆمان دەردەکەوێ کە ئێستە تەنیا دوو شێوەی ئەدەبیی کوردی هەیە. لەبەر ئەوە، بۆ یەکگرتنی زمانەکمان پێویستە ئەو شێوەیەی کە ئەمڕۆ لە کوردستانی عێراقدا بۆ نووسین بەکاردەهێنرێ، لە سنووری دەسەڵاتدا لە شێوەی کرمانجیی ژوورووەوە نێزیك بکرێتەوە و لە هەمان کاتدا، بەپێی توانست؛ بە هەردوو شێوە لاتەنیشتەکەش موتوربە بکرێ. بۆ ئەمەش دەبێ بەر لە هەموو شتێك؛ هەردوو شێوە بنچینەیی یەکە بکەینە بناغەی شیکردنەوە و لێکۆڵینەوە و بەتایبەتی لەم ڕووانەی خوارەوە:

## أ – لە ڕووی مۆرفۆلۆژی یەوە

مۆرفۆلۆژی Morphology بریتی یە لە زانستی چۆنێتی پێکهاتن و گۆڕانی ووشەکانی زمان. ئەم زانستە بەتایبەتی باس لەو گۆڕانانە دەکا کە بەسەر ووشەدا دێ لە کاتی گەردانکردن (تصریف) و بزواندن (اعراب) یاندا. سنووری مۆرفۆلۆژی؛ بەر لە هەموو شتێك گەردانی نێوەکان declension (تصریف الاسماء) و گەردانی کارەکان conjugation (تصریف الافعال) ی زمان دەگرێتەوە.

جا ئەگەر تەماشای زمانی کوردی بکەین؛ دەبینین هەردوو شێوە گەورەکەی (کرمانجیی ژووروو و کرمانجیی نێوەڕاست) لە باری مۆرفۆلۆژی یەوە؛ هێندێ جیاوازی یان لە بەیندا هەیە، گرنگەکانیان ئەمانەی خوارەوەن:

### (١) – جێ نێوەکان (الضمائر) Pronouns

### (أ) – جێ نێوە کەسی یەکان (الضمائر الشخصیة) personal pronouns

کرمانجیی ژووروو، وەك بە لێکۆڵینەوەی خۆم بۆم دەرکەوتووە – بە جۆرێکی گشتی و لە گەڵێك ڕووەوە لە کرمانجیی نێوەڕاست (سۆرانی) کۆنترە. ئەم شێوەیە دوو چەشنە جێ نێوی کەسی بەکاردەهێنێ. چەشنی یەکەم ئەو جێ نێوانەن کە تەنیا لە دۆخی کارایی (حالة الفاعل nominative case) دا (٣٢) بەکار دەهێنرێن و چەشنی دووەمیش ئەوانەن کە تەنیا لە دۆخی خاوەنی (حالة التملك possessive case) دا (٣٣) بەکاردەهێنرێن. شێوەی کرمانجیی ژووروو لەم خۆماڵەی دا؛ لە زمانە ئێرانی یە کۆنەکان دەچێ. ئەمە لە کاتێکدا کە کرمانجیی نێوەڕاست (سۆرانی) وەك زمانی فارسیی تازە، تەنیا یەك چەشنە جێ نێو بەکاردەبا. جا وا لە خوارەوە ئەم باسە نەختێك ڕوونتر دەکەمەوە.

#### أ – کرمانجیی ژووروو

ئەم شێوەیە – وەك گوتمان – دوو جۆرە جێ نێوی کەسی بەکاردەبا:

١ – جێ نێوەکانی دۆخی کارا (حالة الفاعل). ئەم جێ نێوانە ئەمانەن:

ئـه ز ، ez تــو tu ئــه و ew ئــه م em ، هــۆن hon ، ( ٣٤ ) ئــه و(انه)ew(ane) ( ٣٥ ) .
٢ ـ جــێ نێوەكانــی دۆخــی خاوەنــی ( حالة التملــك ) ئەمانــەن :
مــن min تــه te وی wî وێ ( بــۆ نێــر ) wê ( بــۆ مــێ ) مــه me ، وه we
( ئــه ) وان wan(e) .

بــۆ روونــكردنەوەی چۆنێتــی بەكارهێنانــی ئــه م جێ نێوانــه ، چەنــد وێنەیەك بە نــموونــه پێشان دەدەیــن :
بــۆ وێنە ، دەڵێــت : " ئــه ز كــوردم " و ناڵێــت : " مــن كورد م " ، چونكــه " ئه ز كورد م " ( انــا كــردی ) رستەیــەكــه لــه دۆخــی كارایــی دایــه و جــێ نێــوی " مــن " بــۆ دۆخــی كارایــی بەكارنایــەت . هــەروەها دەڵێــت : " تــو كورد یــت " ، " ئــه و كــورد ه " ، " ئــه م كورد ن " ، " هــۆن كورد ن " ، ئــه و ( انــه ) كــورد ن (٣٦) . بێجگــه لــه وەش ، جــێ نێوەكانــی دۆخــی كارایــی لــه گەڵ هەمــوو دەمكات ( صیــغــة ) ــەكانــی تــێنــه پــەر ( الفعــل اللازم intransitive ) دا بەكاردەهێنرێــن .
بــۆ وێنــه دەڵێــت : " ئــه ز دە چــم " ، " ئه ز چووم " " ئــه زێ بچــم " ( ٣٧ ) و ناڵێــت : " مــن دەچــم " ، " مــن چووم " ، " مــنــێ بچــم " . چونكــه كــاری " چــوو ن " كارێكــی تــێنــه پــەرە . هــه روەهــا دەڵێــت : " تــۆ چــووی " ، " ئه و چــوو " ، " ئــه م چــوو ن " ، " هــۆن چــوو ن " ، " ئــه و ( انــه ) چــوو ن " و ناڵێــت : " تــه چــووی " ، " وی چــوو " ( " وێ چــوو " ) ( ٣٨ ) ، " مــه چوو ن " ، " وه چــوو ن " ، " وان چــوو ن " .

بــه لام هــه رچــی جــێ نێوە خاوەنی یەكانــن ، بە تایبــه تــی لەگەڵ رابوردووی كارە تــێپــه ڕەكان ( الافعال المتعدیــة transitive ) دا بەكار دەبرێــن . بــۆ وێــنــه دەڵێــت : " مــن خار " ، " تــه خار " ، " وی خار " ، " وێ خار " " مــه خار " ، " وه خار " ، " ( ئــه ) وان خــار " و ناڵێــت : " ئه ز خار " " تــو خار " و ... هتد .

هــه روەهــا جــێ نێوە خاوەنی یەكان لــه جیاتــی بەركار accusative ( المفعــول ) بەكار دێــن . بــۆ وێنــه دەڵێــت : " تــو مــن دبــیــنــی " tu min dibînî و ناڵێــت : " تــو ئه ز دبــیــنــی " tu ez dibînî .

بێجــگه لەوەش ، ئــه م جــێ نێوانەی دۆخــی خاوەنــی ، لــه حاڵــی خستنه پــاڵ genitive ( مضاف الیــه ) دا بەكاردێــن . بــۆ وێنــه دەڵێــت : " كــوڕێ مــن " و ناڵێــت : " كوڕێ ئه ز " ، چونكــه " كــوڕێ مــن " ( ولدی ) رستەیەكــه لــه دۆخــی خاوەنــی دایــه و جــێ نێــوی " ئــه ز " بــۆ ئه م دۆخــه بەكارنا یــه ت . هــه روەهــا دەڵێــت : " كــوڕێ تــه " ، " كــوڕێ وی " ، " كــوڕێ وێ " ، " كــوڕێ مــه " ، " كوڕێ وه " " كوڕێ وان " و ناڵێــت : " كوڕێ تو " ، " كوڕێ ئەو " ، " كوڕێ ئه م " ، " كوڕێ هــۆ ن " ، " كــوڕێ ئەو ( انــه ) " .

شایانــی باســه كــه پاش تیبــی پێــوەندی preposition ( حــــرف الجر ) تەنیــا جــێ نێوی دۆخــی كارایــی بەكار دێ . بــۆ وێنــه دەڵێــت : " ژ بــۆ من " و ناڵێــت : " ژ بــۆ ئه ز " . هەروەها دەڵێــت : " جــه م ته " و ناڵێــت : " جەم تــو " ( واتــا : لای تــۆ . ســه رنــج : - " جەم " لــه " جنــب " ی عەرەبی یەوە هاتووە ) .

## ب - كرمانجی ی نێوەڕاست

ئــه م شێوەیــه له هەردوو دۆخــەكەدا ( دۆخــی كارایــی و دۆخی خاوەنــی ) هــه ر یەك جۆرە جــێ نێــو بە كاردەبا و ئەوەش ئەمانــه ن :
" مــن " ( یا ئەمــن ) ، " تــۆ ( یا ئه تــۆ ) ، " ئه و " ، " ئێمــه " ، " ئێوە ( یا ئەنگۆ ) " ، " ئەوان " .

لێرەدا شێوەی کرمانجی ی نێوەڕاست لاسایی ی زمانی فارسی ی تازە دەکاتەوە. کە ئەویش تەنیا یەك جۆرە جێ نێو بەکار دەبا و ئەوەش ئەمانەن:
"من"، "تو"، "او"، "ما"، "شما"، "انها (یا ایشان)".

جا ئێستە ئەگەر بمانەوێ کرمانجی ی نێوەڕاست لە کرمانجی ی ژووروو نێزیك بکەینەوە و هەر لەو کاتەشدا کوردی یەکەشمان لە کوردی کۆنی راستەقینە نێزیك بخەینەوە، پێویستە هێندێك لەم ڕێزمانەی شێوەی کرمانجی ی ژووروو بخەینە نێو زمانە ئەدەبی یەکەمانەوە. وەك ئەوەی بەر لە هەموو شتێك جێ نێوی "ئەز" لە بەشی یەکەم (دۆخی کارایی) و بەلایەنی کەمەوە جێ نێوی "وی" و "وێ" لە بەشی دووەم (دۆخی خاوەنی) وەربگرین.

ئەگەر سەرنجێکی ووردی زمانی کوردی بدەین، تێدەگەین کە هێندێ لەم جێ نێوانەی کرمانجی ی ژووروو، هەتا ئەمڕۆش لە هێندێ زاراوای کرمانجی ی نێوەڕاستدا هەر ماون. بۆوێنە: جێ نێوی "ئەز" هێشتا لە پەندێکی پێشیناندا کە بە زاراوای سلەیمانی دەگوترێ ماوە. پەندێکی پێشینان دەڵێ ((ئەگەر زانی ئەزم و ئەگەر نەیزانی دزم)). هەروەها لە هێندێ زاراوای شێوەی موکری دا، جێ نێوی "وی wî" هێشتا ماوە. بۆوێنە موکریانی یەکان دەڵێن: "ئی وی"یە و نالێن "هی ئەو". زۆر جار لە لادێیی یەکانی دەوری هەولێرم بیستووە گوتوویانە: "ماری مە" واتا "ماڵی ئێمە". هەروەها لە دەوری موکریان دەڵێن "ئی وانە" و نالێن "هی ئەوانە". لە زاراوای ڕەواندزیشدا "ئێ" ئامرازی خستنە پاڵە بۆ مێ بینە وەك: "ئەو کچە ئێ کانەبی یە" واتا "ئەو کچە هی کانەبی یە". لە زاراوای پشدەریشدا کەسی سێیەم (الشخص الثالث) لە جێ نێوی خاوەنی دا، بۆ نێرینە "وی wî"یە و بۆ مێ بینە "وێ wê"یە و جێ نێوی نیشانە (ضمیر الاشارة demonstrative pronoun) بۆ نێرینە "ئەوی" و بۆ مێ بینە "ئەوێ"یە. بێجگە لەوەش هێندێ تیپی پێوەندی (حروف الجر preposition) هەن لە شێوەی کرمانجی ی نێوەڕاستدا کە لە بنەڕەتدا لە تیپێکی پێوەندی ی دی و جێ نێوێکی خاوەنی پێکهاتوون کە ئەو جێ نێوانە ئێستە بەکارنایەن. بۆوێنە: تیپی پێوەندی "پێ pê" لە بنەڕەتدا لە "بە" و "وی" یا "وێ" وەهاتووە و بووە بە "بەوێ" و ئەمجا بە "پێ". سەرنجی "دەست بەکارکردن" و "دەست پێ کردن" بدە، دەبینیت ئەو "پێ"یە جێ نێوێکە لە جیاتی "بەکار" دانراوە. لە جیاتی "کار" جێ نێوی "وێ" بەکارهێنراوە و بووە بە "دەست بە وێ کردن" و ئەمجا "دەست پێ کردن". هەروەها ئەگەر سەرنجی "دەست لە بەر خستن" و "دەست لێ خستن" بدەین، بۆمان دەردەکەوێ کە ئەو "لێ"یە لە "لە وێ" وەهاتووە. واتا "دەست لە وێ خستن" بووە بە (دەست لێ خستن). پێشگری (تێ tê) لە (تێ کردن) دا لە (di wê) وەهاتووە کە لە کرمانجی ی ژوورووداهەیە ـ ئەمانە هەموو بەڵگەن بۆ ئەوەی کە ئەو جێ نێوانەی شێوەی کرمانجی ی ژووروو، کە لە شێوەی ئەدەبیماندا بەکارناهێنرێن، بە جۆرێکی گشتی، ڕۆژێ لە ڕۆژان لە کرمانجی ی نێوەڕاستدا هەبوون، بەلام هێدی هێدی خراونەتە پشت گوێ، بۆیە وا ئێستە تەنیا تاکە تاکە لە نێو هێندێ لە زاراواکاندا بەرچاو دەکەون.

ئێستە پێویستە شتێك لە بارەی جێ نێوە خاوەنی یەکانی کرمانجی ی نێوەڕاستەوە بڵێین :

لە کرمانجی ی نێوەڕاستدا؛ جێ نێوە خاوەنی یەکان دەبنە پاشگری ئەو نێوانەی کە دەکەونە پاڵیان . بۆ وێنە :

سەری من دەبێتە ← سەرم
سەری تۆ = ← سەرت
سەری ئەو = ← سەری
سەری ئێمە = ← سەرمان
سەری ئێوە = ← سەرتان
سەری ئەوان = ← سەریان

بەلام شێوەی کرمانجی ی ژوورو ئەم پاشکۆیانە ناناسێ و لە جیاتی ئەوانە جێ نێوەکە بە تەواوەتی دوویات دەکاتەوە . بۆ وێنە دەڵێ :
سەرێ من ، سەرێ تە ، سەرێ وی (وێ) ، سەرێ مە ، سەرێ وە سەرێ وان .

شتێکی ئاشکرایە کە کورتکردنەوەی ووتە ، لە هەر زمانێکدا بێ ، ئەو زمانە هاسانتر دەکا . لەبەر ئەوە مانەوەی ئەم پاشکۆیانە ، لە زمانی ئەدەبیماندا ، لە جیاتی جێ نێوەکان ، شتێکی باشە و بێجگە لەوەش هیچ زیانێك ناگەیەنێ بە یەکێتی ی زمانەکە لەم رووەوە ، سەبارەت بەوەی کە پیاو دەتوانێ ئەگەر نەیویست بەکاریان نەهێنێ . چونکە دوویاتکردنەوەی جێ نێوەکە لە جیاتی ئەم پاشکۆیە ، لە لای خەلکی هەردوو شێوەکە ، شتێکی ناباو (غیر شائع) نی یە .

## (ب)- جێ نێوی بەکارەوە نووساو (الضمیر المتصل بالفعل) .

لە شێوەی کرمانجی ی نێوەڕاستدا؛ کارە تێپەڕەکان جێ نێویان پێوە دەنووسێنرێ . بۆ وێنە ، دەڵێیت : من کردم ، تۆ کردت ، ئەو کردی ، ئێمە کردمان ، ئێوە کردتان ، ئەوان کردیان . بەلام لە شێوەی کرمانجی ی ژووروودا ، ئەم جێ نێوە پێوە نووساوانە بەکار ناهێنرێن . بۆ وێنە : من کر ، تە کر ، وی (وێ) کر ، مە کر ، وە کر ، وان کر . واتا کارەکە (لێرەدا "کر") هەر وەك خۆی دەمێنێتەوە و لە کاتی گەردان کردندا ناگۆڕێ .

ئاشکرایە بوونی ئەو جێ نێوانە لە پاش کاری تێپەڕەوە ، کارێکی وا دەکا کە پێویست بە نێو بردنی جێ نێوی کەسی (الضمیر الشخصی) ی پێش کارەکە نەکا . بۆ وێنە : کردم ، کردت ، کردی ، کردمان ، کردتان ، کردیان . نەك : من کردم ، تۆ کردت ، ئەو کردی ، ئێمە کردمان ، ئێوە کردتان ، ئەوان کردیان . ئەمەش دیارە هاسانی یەکە بۆ زمان . لە کاتێکدا کە لە شێوەی کرمانجی ی ژووروودا گوتنەوەی ئەو جێ نێوە پێویستە ؛ چونکە کاری تێپەڕی ((کر)) بە تەنیا ، پیشانی نادا کە کارەکە بۆچ جێ نێوێك دەگەڕێتەوە . لەبەر ئەوە شێوەی کارکەرو چەشنەی لە کرمانجی ی نێوەڕاستدا هەیە چێترە .

## (ج)- جێ نێوی [خۆ] reflexive pronoun

جێ نێوی ((خۆ)) لە شێوەی کرمانجی ی نێوەڕاستدا گەردان دەکرێ و دەبێتە خۆم ـ خۆت ـ خۆی ـ خۆمان ـ خۆتان ـ خۆیان . بۆ وێنە

دەگوترێ: من خۆم کوشت ـ تۆ خۆت کوشت ـ ئەو خۆی کوشت ـ ئێمە خۆمان کوشت ـ ئێوە خۆتان کوشت ـ ئەوان خۆیان کوشت.
لەکاتێکدا ئەم جێ نێوە لە شێوەی کرمانجی ی ژووروودا گەردان ناکرێ و هەر وەك خۆی دەمێنێتەوە. بۆ وێنە: من خۆە کوشت ـ تە خۆە کوشت ـ وی خۆە کوشت و ... هتد.

بیروڕا م بەرامبەر بەم جێ نێوە هەر وەك بیروڕامە بەرامبەر جێ نێوی بەکارەوە نووساو (تەماشای بەندی پێشوو بکە). واتا جێ نێوی ((خۆ)) بە وێنەی گەردان کراوی بمێنێتەوە بەلامەوە باشترە.

## (٢)ـ نێر و مێ gender

شێوەی کرمانجی ی ژووروو بە پێچەوانەی شێوەی کرمانجی ی نێوەڕاستەوە، وەك زمانە ئێرانی یە کۆنەکان، ڕەسەنی نێر و مێ لە یەك جیا دەکاتەوە. ئەم جیاکردنەوەیەش لە سێ دۆخ دایە.

### أ ـ لە دۆخی خستنە پالدا (فی حالة الاضافة)

بۆ وێنە دەڵێیت: "خوشکا ئازاد" xuşka Azad نەك "خوشکی ئازاد" xuşkî Azad بەلام دەڵێیت "باڤێ ئازاد" bavê Azad نەك "باڤی ئازاد" bavî Azad. واتا؛ ئامرازی خستنە پالێ (اداة الاضافة) دەبێتە (ا a) ئەگەر (مضاف) مێ بێ و دەبێتە (ێ ê) ئەگەر (مضاف) نێر بێ. ئەمە لەکاتێکدا ئەگەر دواتیپی (مضاف) تیپێکی بێ دەنگ (حرف صامت) بوو، وەك ((خوشك)) و ((باڤ)). خۆ ئەگەر دوا تیپی (مضاف) تیپێکی دەنگدار (حرف علة) بوو، وەك ((دا)) و ((برا))، ئەوا ئامرازی خستنە پالێ دەبێتە (یا ya) ئەگەر (مضاف) مێ بێ و دەبێتە (یێ yê) ئەگەر (مضاف) نێر بێ. بۆ وێنە دەڵێیت: "دیا ئازاد" diyaA. لە جیاتی "دایکی ئازاد" و دەڵێیت: "برایێ ئازاد" birayêA لە جیاتی برای ئازاد.

### ب ـ لە دۆخی کەسی سێیەمدا (فی حالة الشخص الثالث)

بۆ وێنە دەڵێیت: "ئەز وی دبینم" ez wî dibînim واتا: "من ئەو (پیاوە) یا ئەو (کوڕە) دەبینم". بەلام دەڵێیت: "ئەز وێ دبینم" ez wê dibînim واتا: "من ئەو (ژنە) یا ئەو (کچە) دەبینم".

### ج ـ لە دۆخی بانگ کردندا (فی حالة النداء) vocative

لەم دۆخەدا (ۆ o) بەکاردەهێنرێ بۆ نێر. وەك: کوڕۆ kuro باڤۆ bavo واتا کوڕە ـ بابە. (ێ ê) بەکاردەهێنرێ بۆ مێ. وەك: کەچێ keçê میکێ ـ واتا: کچێ ـ پووری. (٣٩)، هەر وەك کرمانجی ی نێوەڕاست.

بوونی نێرینە و مێ یینە لە زماندا، هەرچەندە هێندێ سوودی هەیە، بەلام گەلێ جار دەبێتە هۆی قورسکردنی ئەو زمانە. بە تایبەتی کرمانجی ی ژووروو بۆ جیاکردنەوەی نێر و مێ دەستوورێکی ئاشکرای نی یە تا پێڕەوی بکرێ. لەبەر ئەوە بە بیروڕای من پێویستە نێر و مێ بخرێنە پشت گوێ، وەك زمانە ئەدەبی یەکمان خستوویەتیە پشت گوێ. لەم دوو دۆخەی خوارەوەدا نەبێ کە

بە پێویستیان دەزانم .

١ ـ لە کاتێکدا کە رەسەنی نێوەکە ئاشکرا نەبێ لە رستەدا . بۆ وێنە کە گوتت : "هەڤال"، دەشێ ئەو هەڤالە پیاو بێ یا ژن بێ . لە بەر ئەوە کاتێك کە دەخرێتە پاڵ جێ نێوێك یا نێوێك ، یا دەچێتە رستە وە و دەبێتە بەرکار (مفعول) ، پێویستە وای لێ بکرێ کە رەسەنی ئەو هەڤالە دیار بێ . واتا نەگوترێ : "هەڤالی من". بۆ هەردوو رەسەن ، بەڵکو وەك کرمانجی ی ژووروو ی لێ بکرێ. واتا بگوترێ : "هەڤالی من" ئەگەر هەڤالەکە پیاو بوو و بگوترێ "هەڤالا من" ئەگەر هەڤالەکە ژن بوو . هەروەها بگوترێ : "ئازاد دوژمنی خۆی بەزاند" ئەگەر دوژمنەکە نێر بوو و بگوترێ : "ئازاد دوژمنا خۆی بەزاند" ئەگەر دوژمنەکە مێ بوو .

٢ ـ لە کاتی "بانگ کردن دا" (فی حالة النداء) دەبینین شێوەی کرمانجی ی نێوەراست (ە e) بەکار دەهێنێ بۆ بانگکردنی نێرینە . وەك : کوڕە، ڕۆڵە، مامە، خاڵە، بابە. ئەمە ئەگەر دووا تیپی ووشەکە تیپێکی بێ دەنگ بێ .خۆ ئەگەر هاتوو دووا تیپی ووشەکە تیپێکی دەنگدار (علة) بوو، ئەوا هەر وەك خۆی دەمێنێتەوە . وەك برا ! ـ مامۆستا !

لێرەدا ئێمە دەتوانین (ۆ o) ی کرمانجی ی ژووروو و (ە e) ی کرمانجی ی نێوەراست، هەردووکیان شان بە شانی یەك، بۆ بانگکردنی نێرینە لە زمانە ئەدەبی یەکماندا بپارێزین . دەمێنێتەوە ئامرازی بانگکردنی مێ یینە . ئەوەش هاسانە، چونکە لە هەردوو شێوەکەدا وەك یەکە و لە هەردووکیاندا بە (ێ ê) تەواو دەبێ . بۆ وێنە : نەنێ ،خوشکێ ، دایێ، پووری، کچێ (کەچێ) ، بووکێ و ... هتد .

بە کورتی بۆ بانگکردنی نێرینە بڵێین: "بابە" یا "بابۆ" و بۆ بانگکردنی مێ یینە بڵێین : "خوشکێ".

## (٣)ـ ئامرازی ناسینەوە (کە) ـ اداة التعریف (کە)

ئەگەر بمانەوێ لە شێوەی کرمانجی ی نێوەراستدا نێوێکی نەناسراو (اسم نکرة) بکەین بە نێوێکی ناسراو (اسم معرفة) ؛ ئەوا تەماشای دوواتیپی ووشەکە دەکەین ، ئەگەر هاتوو بە تیپێکی بێ دەنگ کۆتایی هاتبوو، ئەوا پاشگری (ەکە eke)ی دەخەینە پاڵ . وەك: بەرد ـ بەردەکە (= بەرد + ەکە) . خۆ ئەگەر هاتوو دوواتیپی ووشەکە دەنگدار بوو، ئەوا یا پاشگری (کە ke) یا (یەکە yeke) ی دەخەینە پاڵ . وەك: مامۆستا ـ مامۆستاکە (= مامۆستا + کە) یا مامۆستایەکە (= مامۆستا + یەکە) (٤٠)

لە کاتی کردنە گەلدا (فی حالة الجمع)، تەنیا (ان an) دەخرێتە پاڵ نێوە ناسراوەکە . وەك بەردەکان (= بەردەکە + ان) ، مامۆستاکان (= مامۆستاکە + ان) یا مامۆستایەکان (= مامۆستایەکە + ان) . ئەوەی شایانی باسە لێرەدا ئەوەیە (ە) ی (ەکە) لە کاتێکدا (ان) ی ئامرازی کردنە گەلی دەخرێتە پاڵ، دەکەوێ . چونکە ئەو دەمە دوو تیپی دەنگدار (ە، ا) لە یەك دەدەن، لەبەر ئەوە یەکەمیان دەکەوێ .

شێوەی کرمانجی ی ژووروو ئەم (کە) ی ناسینەوەیەی بەم جۆرە تێدا نی یە (٤١) . بە بیروڕای من، بوونی ئەم ئامرازە لە زمانی کوردی ئەدەبی دا شتێکی زۆر پێویستە . چونکە ڕێیەکی یەکجار هاسانە بۆ داتاشینی نێوی ناسراو لە نێوی نەناسراو . بێجگە لە وەش پێم وایە ئەم (کە ke) یە هەر بە (کە) بمێنێتەوە باشترە لەوەی ببێتە ـك ik- وەك کرمانجی ی ژووروو . چونکە (ـك ik) لە کوردی دا نەك تەنیا نیشانەی (تعریف) ە

بەڵکو هی کچکە کردنەوە (التصغیر) یشە . لەبەر ئەوە ئامرازی (کە ke-) لە (ـك ik-) بەجێ ترە . هەروەها بەلامەوە پێویست ناکا ئامرازی (کێ kê-) بۆ مێ بێنە بەکاربهێن ؛ چونکە ئەوە هیچ خزمەتێکی رێزمانەکمان ناکا و شتێکی نا ئاشکرا ئاشکرا ناکا . هەموو کەسێك دەزانێ ژن بەشی مێ یینەی مرۆڤە ، ئیتر نیشانەی جیاکردنەوەی پێ ناوێ .

## (٤)- پێشکۆی (ڤە ve) و پاشکۆی (وە we)

لە شێوەی کرمانجیی نێوەڕاستدا پاشکۆی ((وە we- )) ئەم دەورانەی خوارەوە دەبینێ :

١ ـ یا بەشێکە لە تەن (جسم) ی چاوگەی کارەکە (مصدر الفعل) خۆی و جوێ نابێتەوە لێی . وەك ئەوەی دەڵێیت "بووژانەوە" یا "کولانەوە" . لێرەدا "وە we-" بەشێکە لە چاوگەی "بووژانەوە" و "کولانەوە" . چونکە "بووژان" و "کولان" بەتەنیا هیچ مانایەك نادەن بەدەستەوە و بەتەنیاش بەکارنا هێنرێن . واتا لە کوردیدا "دەبووژێ" و "دەکولێ" نی یە . بەڵکو "دەبووژێتەوە" و "دەکولێتەوە" هەیە .

٢ ـ یا بەشێك نی یە لە چاوگەی کارەکە ، بەڵام دەنووسێنرێ بە پاشکۆی کارەکەوە و بەوە ئەم کارانەی خوارەوە دەبینێ :

أ ـ یا مانای کارەکە بەجارێ دەگۆڕێ . وەك ئەوەی دەڵێیت : "خوێندنەوە" . لێرەدا ((وە)) بەشێك نی یە لە چاوگەی "خوێندنەوە" . چونکە "خوێندن" بەتەنیا ، مانایەکی تایبەتی هەیە و ووشەی "دراسة" یا "غناء" ی عەرەبی دەگرێتەوە . بەڵام کە ((وە)) نووسێنرا بە پاشکۆکەیەوە ، ئەو دەمە ماناکەی دەگۆڕێ ؟ و دەبێتە "قراءة" یا "مطالعة" یا "اهتمام" .

ب ـ یا دووپاتکردنەوەی کارەکە دەگەیەنێ . وەك ئەوەی دەڵێیت : "چوونەوە" . لێرەدا ((وە)) بەشێك نی یە لە چاوگەی "چوونەوە" . چونکە "چوون" بەتەنیا مانایەکی تایبەتی هەیە و ووشەی "ذهاب" ی عەرەبی دەگرێتەوە . بەڵام کە ((وە)) نووسێنرا بە پاشکۆیەوە ، ئەو دەمە ماناکەی دەگۆڕێ و دەبێتە "جارێکی دی چوون" ، واتا دووپاتکردنەوەی "چوون" (واتا "عودة") .

ج ـ یا ئەوە دەگەیەنێ کە ڕێبازی کارەکە بۆ پاشەوەیە . وەك دەڵێیت : "سڵەمینەوە" ، "پڕنگانەوە" ، "ترەکینەوە" . ((وە)) ی کوردی لێرەدا دەوری پێشکۆی ((باز)) دەبینێ لە فارسیی تازەدا (بۆ وێنە سەرنجی کاری "باز کشیدن" بە مانای "کشانە دوواوە" بدەن) .

ئەوەی شایانی باسە ئەوەیە ، ئەم ((وە)) یەی کوردی لە هێندێ لە شێوە ئێرانی یەکاندا بەکاردەبرێ . بۆ وێنە لە شێوەی گیلەکی دا ـ کە شێوە یەکە هێشتا بەتەواوی ساغ نەبووەتەوە کە سەر بە چ کۆمەڵە زمانێکی ئێرانی یە ـ ووشەی "ڤەکُن ve kon" بۆ "بکەوە = بکەرەوە" بەکاردەبرێ ، کە بە فارسی "بازکُن" ە . بەڵام دیارە ئەم باسە پێویستی بە لێکۆڵینەوەی فراوانتر هەیە کە جێی ئێرە نی یە .

پاشکۆی ((وە)) ی کرمانجیی نێوەڕاست لە کرمانجیی ژووروروشدا هەر هەیە و هەر ئەو کارانەی سەرەوە دەبینێ . بەڵام ئەوە هەیە لە هێندێ لە زاراواکانی ئەو شێوەیەدا ، بەتایبەتی ؛ لە زاراوای بۆتان و جزیرەدا ، ئەم پاشکۆیە دەبێتە پێشکۆ و لە جیاتی ((وە)) لەوێدا دەبێتە ((ڤە ve- )) . بۆ وێنە لە جیاتی : "ژیانەوە" و "گرتنەوە" و "شاردنەوە" ، دەگوترێ : "ڤەژین" و "ڤەگرتن" و

و "ڤە شارتن".

بەلای منەوە، ((وە)) وەك پاشكۆ بمێنێتەوە باشترە لەوەی ببێتە پێشكۆ. بەتایبەتی چونكە لە هێندێ زاراوای كرمانجیی ژووروودا، وەك زاراوای بادینان، ئەم پێشكۆیە ـ وەك كرمانجیی نێوەراست ـ دەكەوێتە پاشەوە، بەلام لەجیاتی ((وە)) دەبێتە ((ڤە)). بۆ وێنە بە "هاتەوە" دەلێن "هات ڤە" و بە "گەڕایەوە" دەلێن "گەڕا ڤە" لەجیاتی "ڤە هات" و "ڤە گەڕیا". لە زمانی نووسینیشماندا، لام وایە، هەر بەم جۆرە بێ باشترە. واتا هەر وەك ئێستە بە پاشكۆیی بمێنێتەوە، بەلام وەك "ڤە" دەربڕرێ. بەكورتی "هاتە ڤە" و "گەڕایە ڤە"، لە نووسیندا بنووسرێن و چۆن دەخوێنرێنەوە و دەردەبڕێن، ئەوە با هەر كەسە بە ئارەزووی خۆی، یا بە ((ڤە)) یا بە ((وە)) بیكا.

سەرنج ـ تكایە باسی دەنگی ((و W)) و ((ڤ V)) لە بابەتی فۆنۆلۆژی دا (ل ٥٩ – ٦١) بخوێنەرەوە تا بزانیت كەی وچۆن وبە پێی چ جۆرە دەستوورێك دەبێ دەنگی ((وە)) بگۆڕێنەوە بە ((ڤە)).

## (٥) ـ ئامرازی كردنەگەل (اداة الجمع)

ئامرازی كردنەگەل، لە هەردوو شێوەكەدا، لە بنەڕەتدا (-ان an-)ە (٤٢). بۆ وێنە: "كوڕ" تاكە و "كوڕان" "گەلە". تەنیا ئەوە هەیە، ئەو ئامرازە لە شێوەی نێوەڕاستدا ناگۆڕێ. بەلام لە هی ژووروودا دەگۆڕێ.

لە شێوەی ژووروودا و بەتایبەتی لە دۆخی خستنەپال (اضافة) دا دەبێتە ((ێن ên)) یا ((ێت êt)) (لە زاراوای بادینانی دا) یا ((ێد êd)) (لە زاراوای كوردەكانی سۆڤێت دا). بۆ وێنە، دەگوترێ:

| | |
|---|---|
| كوڕێن مـن | kurên min |
| یا كوڕێت مـن | kurêt min |
| یا كوڕێد مـن | kurêd min |

جا لەبەر ئەوەی ئەم دەستوورە لە زاراواكانی شێوەی كرمانجیی ژووروودا، یەك نییە و بەسێ جۆرە: ێن ên-، ێت êt-، ێد êd- بەكاردەبرێ، هەروەها لە رووی رێزمانەوە هیچ هاسانییەك یا پێویستییەك پێشكەش ناكا، دیارە دەست لێ بەردانی، لە زمانی ئەدەبیدا باشترە.

## (٦) ـ بەكارهێنانی پیتی پێوەندی (بۆ bo) preposition: bo

لە كرمانجیی نێوەڕاستدا، پیتی پێوەندیی ((بۆ)) دەكەوێتە پاش هەموو كارێكەوە كە لە دۆخی پێوەندی (حالة الجر) دا بێ. بۆ وێنە:

ئازاد چوو بۆ بەرلین
ئازاد هات بۆ بەرلین

بەلام لە كرمانجیی ژووروودا، ئەم ((بۆ)) یە ناخرێتە دووای كارەكەوە. بۆ وێنە:

ئازاد چوو بەرلین
ئازاد هات بەرلین

پێویست بە لەسەر ڕۆیشتن ناكا ـ كە لە باری رێزمانەوە وا راسترە كە ئەم (بۆ) یە لەم بارەدا بمێنێتەوە وەكو لە بەشی زۆری زمانە هیندۆجەرمەنییەكاندا (بەتایبەتی ئینگلیزی

و ئەڵمانی ) دا ماوەتەوە .

## (٧) - پاشگری نێوی کارا [(وو û) ، (ی î)] ی کارێکی تێنەپەڕ و تێپەڕ

کرمانجیی نێوەڕاست بۆ دروستکردنی نێوی کارای کاری تێپەڕ و تێنەپەڕ، کە لێ ڕێی هەیە. یەکێك لەوانە ئەوەیە ((ن )) ی چاوگەی کارەکە لادەبا و لە جیاتی ئەوە، تیپی دەنگداری درێژی (( وو û )) دەکاتە پاشکۆی (پاشگری) .
بۆ وێنە: مردن - مردوو ، خواردن - خواردوو ، هاتن - هاتوو ، تێگەیشتن - تێگەیشتوو.
خۆ ئەگەر کارەکە بە (în-) کۆتایی هاتبوو ، وەك: فڕین و دزین ، ئەوا پاشگری (în- )
لادەبرێ و لە جیاتی وی پاشگری ( îw- ) ی پێوە دەنووسێنرێ. بۆ وێنە: فڕیو ، دزیو .

بەڵام لە کرمانجیی ژووروودا و هێندێ لە زاراواکانی کرمانجیی نێوەڕاستدا (وەك زاراوای کۆیە و هەولێر) ئەم تیپە دەنگدارە (( وو û- )) دەبێتە تیپی دەنگداری (( ی î- )) واتا :

مردن - مردی mirdî
خواردن - خواردی xuwardî
تێگەیشتن - تێگەیشتی têgeyiştî

جا بۆ ئەوەی پاشگری (ی î- ) لە نێوی کارادا present participle لەگەڵ پاشگری (ی î- ) لە نێوی رووتدا abstract noun (وەك ژیری و خوێندەواری و ... هتد ) لەگەڵ یەك تێکەڵ نەبن، واتا بۆ ئەوەی وشەی (( تێگەیشتی )) (مثقف ) کە لە کرمانجیی نێوەڕاستدا (( تێگەیشتوو )) ە لەگەڵ وشەی (( ژیری )) ( الـوعـی )، لە باری ڕێزمانەوە، بە یەك جۆرە دانەڕشتن نەزانرێن ، دیارە واباشترە کە پاشگری نێوی بەرکار و پاشگری نێوی رووت، هەردووکیان (ی î- ) نەبن و لە یەك جیاواز بن. بۆیە پاشگری نێوی بەرکار، ئەگەر هەر بە (وو û- ) بێ باشترە.

## (٨)- پاشگری نێوی بەرکار [(راو raw-) و (رای ray-)] ی کارێکی تێپەڕ

کرمانجیی نێوەڕاست بۆ دروستکردنی نێوی بەرکار لە کارێکی تێپەڕ، بە شێوەیەکی گشتی ، ڕەگی چاوگەی کارەکە دەگرێ و (( راو raw- )) دەکاتە پاشکۆی.
بۆ وێنە:

خواردن - خوراو xuraw
کردن - کراو kiraw
فرۆشتن - فرۆشراو firoşraw

ئەمە ئەگەر کارە تێپەڕەکە خۆی لە خۆیدا تێپەڕ بوو ، خۆ ئەگەر کارە تێپەڕەکە لە کارێکی تێنەپەڕ دروستکرابوو کە بە an- یا بە din- کۆتایی هاتبێ ئەوا ئەو دەمە ڕەگی کارەکە وەردەگیرێ و پاشکۆی ênraw- ی دەخرێتە پاش . بۆ وێنە:
سووتان - سووتێنراو ، مردن - مرێنراو

لە کرمانجیی ژووروو و هێندێ لە زاراواکانی کرمانجیی نێوەڕاستدا ، ئەم (راو raw- ) ە دەبێتە (رای ray- ) ، کاتێك نێوی بەرکار دادەڕێژرێ.
واتا (کراو) دەبێتە (کرای ) و ... هتد . بەم جۆرە هێندێ جار نێوی بەرکار

(اسم المفعول) لەگەڵ دەمکاتی کەسی دووەم (سیغة المخاطب) دا تێکەڵ دەبێ. بۆ وێنە کەگوترا ((خورای))؛ پیاو نازانێ (نانەکە ((خوراو))ە) یا (تۆ ((خورای)) ت). تا بەم جۆرە، هێندێ سەختی دەکەونە ڕێزمانەوە ئەگەر بێتو (رای ray-) لەجیاتی (راو raw-) بەکار بهێنرێ.

## (٩)- پاشگری نێوی تاک (لاحقة الاسم المفرد)

لە کرمانجی‌ی نێوەڕاستدا پاشگری (ێک êk-) نیشانەی تاکە بۆ ئەو نێوانەی کە بە تیپێکی بێ دەنگ کۆتایی‌یان دێ و پاشگری (یەک yek-) یش نیشانەی تاکە بۆ ئەو نێوانەی کە بە تیپێکی دەنگدار کۆتایی‌یان دێ. بۆ وێنە:

بەرد — بەرد + ێک = بەردێک

گا — گا + یەک = گایەک

بەڵام لە کرمانجی‌ی ژووروو و هێندێ زاراوای کرمانجی‌ی نێوەڕاستدا؛ نیشانەی تاک بۆ ئەو نێوانەی کە بە تیپێکی بێ دەنگ کۆتایی‌یان هاتووە (ەک ek-)ە و بۆ ئەو نێوانەش کە بە تیپێکی دەنگدار کۆتایی‌یان هاتووە، هەر وەک شێوەی نێوەڕاستە؛ واتا (یەک yek-)ە. بۆ وێنە:

گەل — گەل + ەک = گەلەک

ڕێ — ڕێ + یەک = ڕێیەک

وەکو ئاشکرایە ئەگەر جیاوازی‌یەک ببێ، تەنیا لە بەینی (ەک ek-) و (یەک yek-) دایە. بەڵام بە سەرنجێکی کورت؛ بۆمان دەردەکەوێ کە پاشگری (ێک êk-)ی شێوەی نێوەڕاست لە (یەک yek) (واحد)ەوە نزیکترە وەک لە پاشگری (ەک ek-)ی شێوەی کرمانجی‌ی ژووروو.

## (١٠)- ئاوەڵنێوی «تر» و «دی»

((تر)) لە هێندێ زاراوای کرمانجی‌ی نێوەڕاستدا؛ ئاوەڵناوی ژمارەیە؛ وەک: ((ڕۆژێکی تر)). ئەم ((تر))ە لە زاراوای موکری‌دا کە زاراوایەکە گەلێک شوێنەواری کۆن و ڕەسەنی پێوەیە، دەبێتە ((دی)) واتا دەگوترێ ((ڕۆژێکی دی)) لە جیاتی ((ڕۆژێکی تر)). لە زاراواکانی کرمانجی‌ی ژووروشدا دەبێتە ((دی)) یا ((دن))؛ واتا دەگوترێ ((ڕۆژەکی دی)) یا ((ڕۆژەکی دن)).

((تر)) لە کرمانجی‌ی نێوەڕاستدا؛ تەنیا ئاوەڵنێوی ژمارە (صفة العدد) نی‌یە، بەڵکو پاشگری (اسم التفضیل) یشە. بۆ وێنە:

باش — باشتر

خۆش — خۆشتر

جا لەبەر ئەوەی ((تر)) لە زاراوای سلێمانی و لەو ڕێیەشەوە لە زمانی ئەدەبی‌ی ئێستەماندا بۆ دوو شتی جیاواز بەکار دەهێنرێ، هەروەها زۆربەی زۆری کورد زمانان (دی) بۆ ئاوەڵنێوی ژمارە بەکار دەهێنن، بەلای منەوە لە زمانی ئەدەبیدا (دی) بۆ ئاوەڵنێوی ژمارە و (تر) وەکو ئێستە بۆ پاشگری (اسم التفضیل) بەکاربهێنرێ چێترە. بۆ وێنە ((یوم اخر)) بە ((ڕۆژێکی دی)) بکرێتە کوردی، نەک بە ((ڕۆژێکی تر)).

دەبێ ئەوەش بڵێین کە لە زاراوای سلێمانی ـ ئەردەڵان ـ سۆراندا؛ ئاوەڵنێوی

(کە) ش بەکار دەبرێ. کە ئەمە کورتکراوەی ((دیکە = دی + کە)) یە و لە زمانی فارسیی تازەدا بە وێنەی ((دیگر)) دەرهاتووە.

## (١١) - پاشکۆی دۆخ (لاحقة الحالة)

پاشکۆی دۆخ ئەو پاشگرانەن کە لە هێندێ دۆخدا دەنووسێنرێن بە پاشکۆی ناوەکانەوە. ئەم پاشگرانە بە زۆری (ی î و ی ê) ن. بۆ وێنە: لە هێندێ زاراوای کوردی دا؛ تیپی (ی î) دەبێتە پاشگری ناو لە دۆخی کارایی دا (ملحق للاسم فی حالة الرفع) و بەوە دەبێتە ئامرازی ناسینەوە (اداة التعریف). بۆ وێنە ناگوترێ ((پیاو پیاو دەخوا))، بەڵکو دەگوترێ ((پیاوی پیاوی دەخوا)). هەروەها لە هێندێ زاراوادا و لە دۆخی خستنە پاڵ (حالة الاضافة) دا، "مضاف الیە" دەگۆڕێ. بۆ وێنە: لە هێندێ زاراوادا ناگوترێ ((ریشی پیاو)) یا ((پرچی ژن))؛ بەڵکو دەگوترێ ((ریشی پیاوی)) و ((پرچی ژنێ)). واتا ئەگەر "مضاف الیە" نێر بوو، ئەوا (ی î) ی دەخرێتە پاڵ و ئەگەر مێ بوو، ئەوا (یێ ê) ی دەخرێتە پاڵ. لە هێندێ زاراوای دی دا؛ لە هەردوو بارەکەدا "مضاف الیە" تیپی (ی î) ی دەخرێتە پاڵ. وەك ((ئاشی هەباس)) دەبێتە ((ئاشی هەباسی)) و ((کوڕی پیرۆز)) دەبێتە ((کوڕی پیرۆزی)). لە هێندێ زاراوای دی دا ئەگەر "مضاف" بە تیپێکی بێ دەنگ کۆتایی هاتبوو، ئەوا (ی î) دەخرێتە پاڵ "مضاف الیە". خۆ ئەگەر "مضاف" بە تیپێکی دەنگدار کۆتایی هاتبوو، ئەوا (یێ ê) دەخرێتە پاڵ "مضاف الیە". بۆ وێنە ناگوترێ ((شیری مەڕ))، بەڵکو دەگوترێ ((شیری مەڕی)). هەروەها ناگوترێ ((بای پاییز))، بەڵکو دەگوترێ ((بای پاییزێ)).

ئەوەی شایانی باسە؛ ئەوەیە لە کرمانجیی ژووروشدا، هێندێك پاشکۆی لەم بابەتە هەن. بۆ وێنە: دەڵێت: چلو چار زەبەشی بدە مەن (واتا: چلو چار شووتی بدە من)، بەڵام دەڵێت: چلوچار سێڤێ بدە مەن (واتا: چلو چوار سێو بدە من). چونکە زەبەش (شووتی) نێرە و سێڤ (سێو) مێیە. زۆر لەسەر قسە نەڕۆین! ئەم جۆرە پاشکۆیانە لە هەموو شێوە و زاراواکانی زمانی کوردیدا هەن، بەڵام بە زۆری لە زمانی ئەدەبی ئەمڕۆماندا بە کار ناهێنرێن؛ چونکە زاراوای سلێمانی ــ ئەردەڵان کە بنچینەی شێوە ئەدەبی یەکمانن، هەر لە کۆنەوە دەستیان لەم پاشکۆیانە بەرداوە. ئەمەش شتێکی زۆر باشە و خۆشبەختی یەکە بۆ زمانە ئەدەبی یەکمان. چونکە ئەوەی راستی بێ، ئەم پاشکۆیانە؛ بە شێکی زۆریان لە سەر لێ شێواندن و زەحمەتکردنی زمانەکەمان بەولاوە، هیچ جۆرە دەورێکی دی نانوێنێ. لە بەر ئەوە خستنە پشت گوێیان زۆر بە پێویست دەزانم، ئەگەرچی لێکۆڵینەوە و تاوتووکردنیان؛ لە بارەی مێژوویی یەوە، سوود بە زانستی زمانەوانیی کوردی دەگەیەنن. بۆیە لە نامیلکە یەکی دیدا نە ختێك بە دوورو درێژی لێیان دەدوێم.

## (١٢) - جێگۆڕکێی جێناوی پێوەنووساو Agglutination

لە شێوەی کرمانجیی ناوەڕاستدا؛ هێندێ جار کە رستە (جملە) یەك لە ناوێك وکارێك و دوو جێناوی پێوەنووساو (ضمیران متصلان) دا بڕێژرێ، جێناوی بە ناوەوە نووساوەکە لەگەڵ ئەو جێناوەی بە کارەکەوە نووساوە، جێی یەك دەگرن و بەمە لە باری رێزمانەوە؛ سەرلێ شێوانێکی یەکجار زۆر پەیدا دەکەن؛ بە تایبەتی بۆ ئەو کوردانەی

بە کرمانجیی نێوەڕاست نادوون و هەروەها بۆ ئەو بێگانانەی کە تازە فێری کوردی دەبن. وا لە خوارەوە چەند نموونەیەك پێشان دەدەم.

١ ـ پارەت بۆ ناردم

٢ ـ پارەم بۆ ناردیت

رستەی ((پارەت بۆ ناردم)) ئەگەر بێتو پێشانی بێگانە یەکی بدەیت کە تازە فێری زمانی کوردی دەبێ، یا پێشانی کوردێکی بدەیت کە شێوەی کرمانجیی نێوەڕاست نەزانێ، مانای رستەکە بەم جۆرە لێك دەداتەوە:
((من پارەم بۆ تۆ نارد)). چونکە ((پارەت)) بە تەنیا؛ مانای ((پارەی تۆ)) یە و ((ناردم)) بە تەنیا؛ مانای ((من ناردم))ە.

هەروەها رستەی دووەمیش ((پارەم بۆ ناردیت)) وا لێك دەداتەوە:
((تۆ پارەت بۆ من نارد)). چونکە ((پارەم)) بە تەنیا؛ مانای ((پارەی من)) ە و ((ناردیت)) بە تەنیا؛ کارێکە تێزیکە لە کاری ((ناردت)) ەوە کە بۆ کەسی دووەمی تاك (الشخص المخاطب المفرد) بەکار دێ.

ئەم جێ گۆڕکێ یە لە زماندا؛ پێی دەگوترێ Agglutination.
بە بیروڕای هێندێ لەوانەی کە لە زمانی کوردی کۆڵیونەتەوە؛ زمانی کوردی لە ژێر تاوی زمانی تورکی دا تووشی ئەم جێ گۆڕکێ یە بووە. بۆ ئەمەش هیچ بەڵگە یەکیان بە دەستەوە نی یە.

بە بیروڕای من واباشە لەجیاتی رستەی یەکەم ((پارەت بۆ ناردم)) بگوتری ((پارەت نارد بۆم)) یا ((پارەت بۆم نارد)). هەروەها لەجیاتی رستەی دووەم ((پارەم بۆ ناردیت)) بگوترێ ((پارەم نارد بۆت)) یا ((پارەم بۆت نارد)) کە هەردووکیان لە قسەکردندا بەکاردەبرێن. ئەمجا وێنەی ((پارەت بۆ ناردم))؛ بەجارێ وبەتایبەتی لە نووسیندا؛ بخرێتە پشت گوێ.

وا لە خوارەوە چەند وێنەیەکی دی لەم بابەتە بە نموونە پێشان دەدەم:
لە جیاتی ((بۆم نووسیت)) بگوترێ ((نووسیم بۆت)) یا ((بۆتم نووسی)).
لە جیاتی ((لێم سەندیت)) بگوترێ ((لێتم سەند))
ولە جیاتی ((لێت سەندم)) بگوترێ ((لێمت سەند))
ولە جیاتی ((ئەم باسەم لەگەڵ کردنەوە)) بگوترێ ((ئەم باسەم کردەوە لەگەڵیان))
ولەجیاتی ((درێخیت بۆ ناکەم)) بگوترێ ((درێخی ناکەم بۆت))
ولەجیاتی ((قسەیان بۆ بکە)) بگوترێ ((قسە بکە بۆیان)).

## (١٢) - کارەکان The verbs

بۆ ئەوەی بزانین کارەکانی شێوەی کرمانجیی ژووروو، لەگەڵ کارەکانی زمانی نووسینمان، تا چ ئەندازەیەك لەیەك دەچن، یا جیاوازن لەیەك، پێویستە جارێ پێچێك لە بارەی کارەکانی زمانی کوردییەوە بدوێین و ئەوجا کارەکانی هەردوو شێوە سەرەکیی یەکە لەگەڵ یەك بەراورد بکەین .

کار، بە شێوەیەکی گشتی، لە زمانی کوردیدا و بەتایبەتی لە هەردوو شێوە سەرەکیی یەکەدا، و بە شێوەیەکی تایبەتی تر، لە زمانی نووسینماندا، پێنج جۆرە :

(١) ـ یا بە (ان an-) کۆتایی دێ، وەك: دان ـ مان ـ لێنان ـ دامان ـ رمان .

(٢) ـ یا بە (ین în-) کۆتایی دێ، وەك: هانین ـ بەزین ـ فڕین ـ دادڕین ـ هاڕین .

(٣) ـ یا بە (وون ûn-) کۆتایی دێ، وەك: چوون ـ بوون ـ بەربوون ـ لا چوون ـ دروون .

(٤) ـ یا بە (تن tin-) کۆتایی دێ، وەك: رشتن ـ هاتن ـ بژارتن ـ پالاوتن ـ خستن .

(٥) ـ یا بە (دن din-) کۆتایی دێ، وەك: کردن ـ مردن ـ بردن ـ خواردن .

تاکە جیاوازییەك لەم رووەوە ئەوەیە، دەنگی (د d) ی ئەو کارانەی لە شێوەی نێوەڕاست و ژێرووودا، بە (دن din-) تەواو دەبن، لە شێوەی ژووروودا دەکەوێ . بۆ وێنە: (کردن) دەبێتە (کرن) و (مردن) دەبێتە (مرن) و ... هتد (٤٣) .

ئەوەی شایانی باسە، ئەوەیە باسێکی کورتی ئەم (د) یە و پێویستیی مانەوەی لە زمانی نووسینماندا لە ل. (٥٨) دا و لە بابەتی فۆنۆلۆژی دا کراوە .

کار لە زمانی کوردی دا بە گشتی، یا سادە (بسیط) یە وەك بڕین ـ سووتان ـ نالاندن . یا ناسادە (مرکب) ە . ناسادەش یا لە دوو پارچە (کارێکی سادە و پارچەیەکی دی کە کار نە بێ) پێك دێ، وەك: دەرکردن ـ پێ دان ـ لێ خستن. یا لە سێ پارچە (کارێکی سادە و دوو پارچەی دی کە کار نە بن) پێك دێ، وەك: جێ‌شتلێ نان ـ دەرباز بوون ـ باوەڕ پێ کردن ـ سەر لێ دان . ئەمەش لە هەردوو شێوە سەرەکیی یەکەدا وەك یەکە .

هەروەها کار لە زمانی کوردی دا و بە تایبەتی لە هەردوو شێوە سەرەکیی یەکەدا ـ یا تێپەڕ (متعدي) ە یا تێنەپەڕ (لازم) ە . هەر کارێك بەرکار (مفعول) یکی بوو، ئەوا تێپەڕە، وەك: "خواردن". خۆ ئەگەر بەرکاری نەبوو، ئەوا تێنەپەڕە، وەك: "نووستن".

کاری تێپەڕ، یا سادەیە، وەك: "هاڕین"، "رستن"، "شتن"، یا ناسادەیە وەك: "نزیز کردن"، "بازدان"، "دەست لێ خستن".

ئەو کارانەی کە بە (اندن andin-) کۆتاییان دێ، لە هەردوو شێوەکەدا تێپەڕن . وەك (شاندن = ناردن) و (رژاندن) . هێندێ کاری تێپەڕ هەن کە بێجگە لە پاشگری ـاندن، هێندێ جار لە جیاتی وی، بە پاشگری (تن tin-) کۆتاییان دێ، وەك: "رژاندن" و "رشتن" لە شێوەی نێوەڕاستدا و "بژێراندن" و "بژارتن" لە شێوەی کرمانجیی ژووروودا .

بێجگە لەوەش دەبێ بزانین کە لە هەردوو شێوە سەرەکیی یەکەدا ئەو کارانەی بە "تن tin-" کۆتاییان دێ، یا تێنەپەڕن، وەك: "کەوتن" یا تێپەڕن، وەك: "گەستن" و ئەو کارانەش کە بە "ـین în-" کۆتاییان دێ، یا تێنەپەڕن، وەك: "بەزین" یا تێپەڕن، وەك: "دزین".

ئەوەمان نابێ لە بیر بچێ کە ئەم (ـین în-) ە هێندێ جار لە هەردوو شێوەکەدا دەبێتە (یان yan)، وەك: "گرین" و "گریان". جا لە کاتێکدا کە ئەم (یان) ە لە شێوەی کرمانجیی ژووروودا هەر (یان) ە، هێندێ جار لە شێوەی کرمانجیی نێوەڕاستدا دەبێتە (ان an)، وەك ئەوەی "بەزین" دەبێتە "بەزان" و "رەوین" دەبێتە "رەوان"،

لە کاتێکدا لە شێوەی کرمانجی ی ژووروودا دەبێتە ((بەزیان)) و ((رەویان)) . پێم وایە شێوەی ژووروو لەم بارەیەوە راستترە لە هی نێوەراست. واتا ((گەریان)) و ((ترسیان)) لە ((گەران)) و ((ترسان)) ی زاراوای سلەیمانی راستترن . کە ئەم وێنە راستەشهێشتا لە هێندێ لە زاراواکانی شێوەی نێوەراستیشدا دەبیسترێ. بۆ وێنە: سەرنجی کاری ((مریاوە)) و ((سووتیاوم)) و ( مناڵەکە ترسیاگە )بدە. تەنیا جیاوازی یەك کە لە نێوان هەردوو شێوە سەرەکی یەکەدا هەبێ لەم رووەوە ئەوەیە؛ پاشگری (-یان yan- ) هێندێ جار لە شێوەی ژووروودا دەبێتە (-هان han-) کە ئەمە لە شێوەی نێوەراستدا نی یە و لە شێوەی ژوورووشخۆیدا زۆر کەم و دەگمەنە .

ئەو کارانەی بە پاشگری (-ان an-) تەواو دەبن ، وەك : ((زان )) ،هێندێ جار، لە هەردوو شێوەکەدا ئەو (-ان an-) ، دەبێتە (ین yîn- ) . بۆ وێنە: (زان ) دەبێتە (زایین ). جا ئەگەرچی ئەم دەستوورە لە شێوەی نێوەراستدا ، وەك شێوەی ژووروو گشتی نی یە ، بۆ وێنە: ((مان )) و ((دان )) لە شێوەی نێوەراستدا نابنە ((ما یین )) و ((دایین )) وەك شێوەی ژووروو، بەلام بەکارهێنانی ئەم وێنەی دووایی یە لە شێوەی ژوورووشدا هەرکەمە .

شایانی باسە ئەو کارانەی کە بە (-ان an-) تەواو دەبن، یا تێنەپەڕن، یا تێپەڕن . ئەو کارانەی کە تێنەپەڕن، بە (-اندن andin) دەبنە تێپەڕ. بۆ وێنە: ((رژان )) کارێکی تێنەپەڕە، بەلام ((رژاندن )) کارێکی تێپەڕە. لێرەدا دەبێ ئەوەش بڵێین ؛ هێندێ کار هەن لە شێوەی نێوەراستدا بە (-ان ) تەواو دەبن، بەلام لە شێوەی ژووروودا هەر ئەو کارانە بە (-ین ) تەواو دەبن . بۆ وێنە: ( ترسان ) دەبێتە ( ترسین ) و ( سووتان ) دەبێتە ( شەوتین )، کە ئەمەش هیچ جۆرە جیاوازی یەك لەگەڵ شێوەی نێوەراستدا لەم رووەوە پەیدا ناکات . چونکە ئەم دوو جۆرەیە لە شێوەی نێوەراستیشدا هەیە. بۆ وێنە سەرنجی ((بەزان)) و ((بەزین )) یا (وەران )و (وەرین ) بدە . کە ئەمانەش لە هەردوو دۆخەکەدا بە پاشگری (-اندن )) دەبنە کاری تێپەڕ . بۆ وێنە : ( بەزاندن ) و ( وەراندن ) . واتا لە هەردوو شێوەکەدا بە هیچ کولۆجێك ((بەزیندن )) و ((وەریندن )) نی یە . بەلام دەبێ ئەوەش بزانین کە کۆمەڵێکی گچکە لەکاری تێنەپەر هەن ، کە کارە تێپەڕەکانیان لە رەگێکی دی یەوە دێن، جیا لە رەگی کارە تێنەپەڕەکە . بۆ وێنە:( بوون ) و (کردن ) یا (کەوتن ) و (خستن ) یا ( هاتن) و (هێنان / ئانین ) . ئەمەش لە هەردوو شێوەکەدا وەك یەکە .

ئەو کارانەی کە بە (-وون ûn- ) تەواو دەبن، ئەوانیش یا تێنەپەڕن، یا تێپەڕن. بەلام ئەم کارانە ژمارەیان زۆر کەمە . وەك (چوون) و ( بوون ) و ( جوون ). و (دروون) و ( دوون ) و ( سوون) . تەنیا جیاوازی یەك لەم بارەیەوە ئەوەیە؛ لە شێوەی ژووروودا ئەو (-وون ûn-) ، هێندێ جار دەبێتە (-ین yîn- ) یا (تن tin- ) وەك ئەوەی (دروون) دەبێتە ( درووتن ) یا (جوون ) دەبێتە (جووتن ) یا ((چوون )) دەبێتە ((چووین )) یا ((بوون )) دەبێتە ((بووین )) . ئەمەش جیاوازی یەکی بنەڕەتی دروست ناکا . چونکە هەر ئەو کارانەی شێوەی نێوەراست و هەر بەو وێنەیە، لە شێوەی ژوورووشدا شتێکی باون . واتا لە کاتێکدا شێوەی ژووروو ( بووین ) و ( چووین )و (جووتن ) و ( درووتن ) بەکاردەبا ؛ ( بوون ) و (چوون ) و (جوون ) و ( دروون ) هەر بەو مانایانە و بۆ ئەو ئامانجانە بەکار دەبا . لەبەر ئەوە ئەگەر ئەو کارانە بەو وێنە یەی ئێستە هەیە، لە شێوە ئەدەبی یەکماندا بمێنێتەوە، شتێکی نەناسراو نابێ لای کوردی ژووروو.

ئەو کارانەی کە بە پاشگری (-دن din-) کۆتایی یان دێ، وەك (کردن) و (مردن) و (بردن) یا تێپەڕن، یا تێنەپەڕن لە هەردوو شێوەکەدا. تەنیا جیاوازییەك لەم ڕووەوە ئەوەیە، دەنگی (د d) لە شێوەی ژووروودا دەکەوێ. ئەم بابەتەش لە (ل ٣٥ و ٥٨) دا باسکراوە و لێرەدا پێویست بە لێدووانی پتر ناکا.

بە کورتی: جیاوازی لە بەینی وێنەی داڕشتنی کار لە هەردوو شێوە سەرەکی یەکەدا ئەوەندە کەمە کە دەتوانین بڵێین هەر نی یە.

## چەند ووشەیەك لەبارەی لێکسیکۆلۆژیی کارەکانەوە

ژمارەیەکی یەکجار زۆری کارەکانی شێوەی کرمانجی ژووروو، لە ڕووی لێکسیکۆلۆژییەوە، خۆیی نین. بۆ وێنە:

((غەیدین)) ـ واتا (دڵ ئێشان) ـ (غەید) لە (غیظ) ی عەرەبییەوە هاتووە.
((سل بوون)) ـ واتا (تووڕە بوون) ـ (سل) لە (زعل) ی عەرەبییەوە هاتووە.
((بەرقین)) ـ واتا (تیشکدان) ـ (بەرق) لە (برق) ی عەرەبییەوە هاتووە.
((تەلفین)) ـ واتا (لە نێو چوون) ـ (تەلف) لە (تلف) ی عەرەبییەوە هاتووە.
((هەرکین)) ـ واتا (جووڵان) ـ (هەرك) لە (حرك) ی عەرەبییەوە هاتووە.
((عەجبین)) ـ واتا (سەرسووڕمان) ـ (عەجب) لە (عجب) ی عەرەبییەوە هاتووە.
((مەشین)) ـ واتا (ڕۆیشتن) ـ (مەشی) لە (مشی) عەرەبییەوە هاتووە.
((خەزبین)) ـ واتا (ڕك هەستان) ـ (خەزب) لە (غضب) ی عەرەبییەوە هاتووە.
((حەیرین)) ـ واتا (واقووڕمان) ـ (حەیر) لە (حيرة) ی عەرەبییەوە هاتووە.
((عەزبین)) ـ واتا (ئازاردان) ـ (عەزب) لە (عذاب) ی عەرەبییەوە هاتووە.
((عەلمین)) ـ واتا (فێر بوون) ـ (عەلم) لە (علم) ی عەرەبییەوە هاتووە.
((لەحقین)) ـ واتا (پێداگەیشتن) ـ (لەحق) لە (لحق) ی عەرەبییەوە هاتووە.
((یازمیش کرن)) ـ واتا (نووسین) ـ (یازمیش) ووشەیەکی تورکی یە.

ئەمانەی سەرەوە تەنیا چەند نموونەیەکی کەمن. بەڵام ئەوەی سەرنج ڕادەکێشێ ئەوەیە، ئەم ووشە بێگانانەی کە هێنراونەتە کوردییەوە، سەریان بۆ شۆڕکراوەتەوە بۆ دەستووری فۆنۆلۆژی و مۆرفۆلۆژیی زمانی کوردی، بە جۆرێ کە ئەگەر پیاو لە هێندێکیان باش ووردنەبێتەوە نازانێ کە خۆیی نین. لەگەڵ ئەوەشدا، تا پێمان دەکرێ، دەبێ تەنێ ووشەی کوردیی پەتیی ڕاست لە زمانە ئەدەبییەکەماندا بەکاربەرین.

## گەردان کردنی کارەکان conjugations

بەر لە هەموو شتێك دەبێ بزانین کە کار (الفعل verb) لە کوردیدا و لە هەموو شێوەکانیشیدا، لە باری بیناوە دوو جۆرە:

(١) ـ کاری کارا زانراو (الفعل المبنی للمعلوم active voice).
(٢) ـ کاری کارانە زانراو (الفعل المبنی للمجهول passive voice).

هەروەها هەموو کارێکیش چوار دەمکات (صیغة mood) ی هەیە.

(١) ـ دەمکاتی ئاگاداری (الصیغة الدلیلیة indicative mood).
(٢) ـ دەمکاتی ئیحتیمالی (الصیغة الاحتمالیة subjunctive mood).
(٣) ـ دەمکاتی فەرمانی (صیغة الامر imperative mood).

( ٤ ) ـ دەمکاتی مەرجی (صیغة الشرط conditional mood ) .
هەروەها هەموو کارێکیش ، دوو دۆخی نیوی (حالات اسمیة nominal forms )ی هەیە :
( ١ ) ـ دۆخی کارایی و بەرکاری (حالة الفاعل والمفعول particip/le ) .
( ٢ ) ـ دۆخی جاوگەیی (حالة المصدر infinitive ) .
ئاشکرایە کە کات بە پێی دەمکات دابەش دەکرێ و بەم دابەشکردنەش دەگوترێ ((گەردان کردن "التصریف" conjugation) .

## گەردان کردنی کاری تێپەڕ و تێنەپەڕ

ئێستە لێرەدا هەوڵ دەدەین کارێکی تێپەڕ و کارێکی تێنەپەڕ لە هەردوو شێوەکە وەربگرین و بە پێی ئەو دەمکاتانەی سەرەوە گەردانیان بکەین و ئەوجا لەگەڵ یەکدی دا بەراوردیان بکەین ، تا بزانین لە چ رووبەکەوە وەك یەکن و لە چ رووبەکەوە جیاوازن . بۆ ئەمەش وا جارێ کاری ((کەوتن kewtin )) کە کارێکی تێنەپەڕە و لە شێوەی کرمانجیی ژووروودا ((کەتن ketin ))ە بە نموونە دەهێنینەوە .

گەردانکردنی کاری ((کەتن = کەوتن م ))
١ ـ لە دەمی رانەبووردوودا (المضارع ، الحاضر present tense )
(أ) ـ لە دەمکاتی ئاگاداریدا (فی الحالة الدلیلیة indicative mood )

| کەتن | کەوتن |
|---|---|
| ez dikevim | min (d)ekewim |
| tu dikevî | to (d)ekewî(t) |
| ew dikeve | ew (d)ekewê(t) |
| em dikevin | ême (d)ekewîn |
| hon dikevin | êwe (d)ekewin |
| ew dikevin | ewan (d)ekewin |

ئەگەر سەرنجێکی ئەمەی سەرەوە بدەین ، دەبینین جیاوازی نێوانی هەردوو شێوەکە لە باری گەردانکردنیانەوە ، لەم دەمکاتەدا ، ئەوەیە کە کەسی سێیەم لە جیاتی "بکەوێ bikewê" "بکەڤە bikeve" یە و هەروەها کەسی یەکەمی کۆ first person plural لە جیاتی "بکەوین bikewîn" "بکەڤن bikevin"ە . بەڵام دەبێ ئەوەش بزانین ، ئەم جیاوازییە لە شێوەی ژووروودا گشتی نییە ، بەڵکو لە هێندێ زاراواکانیدا ، لە جیاتی dikeve دەڵێن dikevê وەك شێوەی نێوەراست . لە هێندێ زاراواکانی دی هەر ئەو شێوەیە دا ، لە جیاتی dikeve دەڵێن dikevît یا dikevit . هەروەها لە هێندێ لە زاراواکانی هەر ئەو شێوەیە دا ، لە جیاتی "ئەم دکەڤن em dikevin" دەگوترێ em dikevîn یا em dikevî کە یەکەمیان وەك شێوەی نێوەراستە و دووەمیان لەوەوە هاتووە .
جا ئەمە نەك بۆ کاری (کەتن = کەوتن ) وایە بە تەنیا ، بەڵکو بۆ

کاری (بینین) وگەلێ کاری دیشوایە . بۆ وێنە :لە هێندێ لە زاراواکانی شێوەی کرمانجی ی ژووروودا،لە جیاتی (ئەم دبینن em dibînin)؛ دەگوترێ (ئەم دبینین em dibînîn) و (ئەم دبینی em dibînî) . ئەمانەش خۆیان لە خۆیاندا نیشانەن بۆ ئەوەی کە شێوەی نووسینی ئەدەبیمان لەم رووەوە تەنگە بەر نی یە .واتا کاتێ لە (دەکەوێ) بۆ کەسی سێ یەم و (دەکەوین) بۆ کەسی یەکەمی گەل بەکار دێنین ،ئەمە بەلای هەموو کوردێکی ژووروومەوە ،شتێکی نەناسراو نی یە .

(ب) ـ لە دەمکاتی ئیحتیمالی دا (فی الحالة الاحتمالية (subjunctive mood

| کەتن | | کەوتن |
|---|---|---|
| (bila) ez bikevim | (٤٤) | (ba) min bikewim |
| (bila) tu bikevî | | (ba) to bikewî(t) |
| (bila) ew bikeve | | (ba) ew bikewê(t) |
| (bila) em bikevin | | (ba) ême bikewîn |
| (bila) hon bikevin | | (ba) êwe bikewin |
| (bila) ew bikevin | | (ba) ewan bikewin |

ئەگەر تەماشایەکی سەرەوە بکەین ،دەبینین جیاوازی ی هەردوولا،تەنێ لەو جێ یانەدایە کە لە دەمکاتی ئاگاداری دا دەستمان بۆ راکێشا . لەبەر ئەوە دووپاتکردنەوەیان بە پێویست نازانم .

سەرنج : لەو کارانەدا کە بەتیپی دەنگدار دەست پێ دەکەن ،پێشگری bi- لەگەڵ ئەو تیپە دەنگدارە یەك دەگرێ . بۆ وێنە :

ئاخافتن —— ئەز باخێڤم ... هتد. axaftin —— ez baxêvim...htd.

ئەمەش ئەگەر بە رێزمانی شێوەی کرمانجی ی نێوەڕاستیش بیگری ،هەروای لێ دەکرێ . واتا لەم رووەوە جیاوازی یەك ،لە نێوانی دوو شێوەکەدا نی یە .

(٢) ـ لە دەمی رانەبوردووی بەردەوامدا (الحاضر المستمر) present continuous

(أ) ـ لە دەمکاتی ئاگاداری دا indicative

| کەتن | کەوتن |
|---|---|
| ez dikevime | نی یە |
| tu dikeviye | |
| ew dikeviye | |
| em dikevine | |
| hon dikevine | |
| ew dikevine | |

( ب ) ــ لە دەمکاتی ئیحتیمالی دا

| کەوتن | کەتن |
| --- | --- |
| نی یە | نی یە |

ئەم دەمە ( دەمی رانەبوردووی بەردەوام ) ؛ لە شێوەی ئەدەبیماندا نی یە . بەڵکو لە جیاتی ez dikevime و ez dibînime و ez digirîme ( من وا دەکەم ) ( من وادەبینم ) ( من وادەگریم ) و ... هتد بەکاردێنرێن . جا ئێستە دەبێ لێکی بدەینەوە ؛ کە ئەم دەمکاتە پێویستە لە شێوەی ئەدەبیماندا بێ یان نا . بە بیروڕای من ببێ چێتترە . چونکە لام وایە ئەم ( ـە e ) ی دووای کارەکە ( بۆ وێنە : سەرنجی dikevime بدە ) لەگەڵ ( ئە e ) ی تیپی پێوەندی ( حرف الجر ) لە رستەی (( دەکەومە خوارێ )) دا هەر یەکە . ئەوەی شایانی باسە ؛ ئەم ( ئە e ) یە لە شێوەی کرمانجی ی ژووروشدا هێندێ جار بەکاردەبرێ . بۆ وێنە : دەگوترێ (( سێوا من کەت ئەردێ )) ــ واتا بێ ( ئە ) ــ یا دەگوترێ (( سێوا من کەتە ئەردێ )) ــ واتا لەگەڵ ( ئە ) . ئەم ( ئە ) یە بەلای منەوە ، هەر ئەو تیپە پێوەندی یەی سەرەوەیە ؛ بەڵام لە شێوەی ژووروودا وای لێ هاتووە ، بێ وشەی پاش تیپەکەش بەکاربهێنرێ . واتا کە دەڵێن : (( بۆ کوێ دەچیت ؟ )) تۆ دەڵێیت ؛ (( دەچمە سینەما )) . ئەمە ئەوە ئەگەیەنێ ــ ئەگەر بێتوو تۆ بەرێ وە بیت ، کارەکەت کارێکی رانەبوردووی بەردەوام دەگەیەنێ . جا لام وایە ئەمەیە وای لێ هاتووە کە لە شێوەی سەرووودا بەبێ وشەی پێوەندار ــ کە لێرەدا " سینەما " یە ــ بەکاربهێنرێ وەکە گوترا " ئەز دچمە " بزانرێ کە کارەکە بەردەوامە و تەواو نەبووە .

( ٣ ) ــ لە دەمی رابوردووی سادەدا ( الماضی البسیط preterite

( أ ) ــ لە دەمکاتی ئاگاداری دا indicative

| کەوتن | | کەتن | |
| --- | --- | --- | --- |
| min | kewt<u>im</u> | ez | ket<u>im</u> |
| to | kewt<u>î</u>(t) | tu | ket<u>î</u> |
| ew | kewt <u>ø</u> | ew | ket <u>ø</u> |
| ême | kewt<u>în</u> | em | ket<u>in</u> |
| êwe | kewt<u>in</u> | hon | ket<u>in</u> |
| ewan | kewt<u>in</u> | ew | ket<u>in</u> |

بە سەرنجدانێک دەبینین ، جیاوازی یەکانی هەردوو لا ؛ هەر لە یەک شوێندایە . ئەوەش کەسی یەکەمی گەلە . واتا (( em ketin )) بەرامبەر (( ême kewtîn )).

ئەمەش هەر لە وێنەی ئەو جیاوازی یەیە کە لە دەمی رانەبوردوودا دیمان . واتا ئەم وێنەیە لە شێوەی ژووروودا گشتی نی یە ، بەڵکو لە هێندێ زاراوای بادینانی دا دەگوترێ (em ketîn) لە جیاتی ( em ketin ) هەروەها لە زاراوای بۆتاندا دەگوترێ (em ketî) لە جیاتی ( em ketin ) کە دیارە ( em ketî ) لە ( em ketîn ) ەوە هاتووە . (٤٥)

(ب) ـ لە دەمکاتی ئیحتیمالی دا

| کەتن | کەوتن |
| --- | --- |
| نییە | نییە |

(٤) ـ لە دەمی رابوردووی ناتەواو دا (الماضي الناقص imperfect tense)

(أ) ـ لە دەمکاتی ئاگاداری دا

| کەتن | کەوتن |
| --- | --- |
| ez diketim | min (d)ekewtim |
| tu diketî | to (d)ekewtî(t) |
| ew diket ϕ | ew (d)ekewt ϕ |
| em diketin | ême (d)ekewtîn |
| hon diketin | êwe (d)ekewtin |
| ew diketin | ewan (d)ekewtin |

بە سەرنجێکی کەم دەبینین، تەنیا جیاوازییەک، لە رووی گەردانەوە، لە -tîn و -tin دایە کە لەوە پێش باسمان کردووە .

(ب) ـ لە دەمکاتی ئیحتیمالی دا

| کەتن | کەوتن |
| --- | --- |
| (bila) ez biketam‿a | (ba) min bikewtimaye |
| (bila) tu biketayî | (ba) to bikewtîtaye |
| (bila) ew biketa | (ba) ew bikewtaye |
| (bila) em biketana | (ba) ême bikewtînaye |
| (bila) hon biketan‿a | (ba) êwe bikewtinaye |
| (bila) ew biketan‿a | (ba)ewan bikewtinaye |

هەرچەندە پیاو بە یەکەمین سەرنج، وا تێ دەگا کە گەردانی کارەکە لەم دۆخەدا لە هەردوو شێوەکەدا زۆر دوورن لە یەکەوە، بەلام ئەمە وانییە . بە زۆری ئەوەی کە پیاو دەخاتە سەر ئەم باوەڕە، ئەوەیە کە (کەوتن) تیپی (و)ی پترە لە (کەتن) و لە کاتی گەردانکردندا پاشگری (-ye) دێتە دووای ئەو کارانەوە کە بە پێی دەستووری شێوەی کرمانجیی نێوەڕاست گەردان دەکرێن . ئەگەر ئەو دوو شتە بخەینە حسابەوە، ئەوا جیاوازی بەینیان بەو وێنە گەورەیە نایەتە بەرچاو .

(٥)_ لە دەمی رابوردووی ناتەواوی بەردەوامدا imperfect continuous

| کەتن | کەوتن |
|---|---|
| ez diketime<br>tu diketiye<br>ew diketiye<br>em diketine<br>hon diketine<br>ew diketine | نی یە |

ئەم دەمکاتە لە شێوەی ئەدەبیماندا نی یە. ئەم ( e ) یەی پاش کاری diketime وەك ئەوە وایە دەنگی ( e ) بکەیتە پاشگری دەمکاتی dekewtim وبلێیت dekewtime و... هتد. لام وایە ئەم ( e ) یە هەر وەك ئەو ( e ) یە یە کە لە دەمکاتی ئاگاداری ی دەمی رانەبوردووی بەردەوامدا باسمان کرد (تەماشای ل ٣٩ بکە).

٦_لە دەمی رابوردووی تەواودا (الماضی التام) perfect tense

(أ) _ لە دەمکاتی ئاگاداری دا

| کەتن | کەوتن |
|---|---|
| ez ketime | min kewtûm |
| tu ketiye | to kewtûy(t) |
| ew ketiye | ew kewtûwe |
| em ketine | ême kewtûyn |
| hon ketine | êwe kewtûn |
| ew ketine | ewan kewtûn |

جیاوازی بەینی ئەم دووانە لە جیاوازی پاشگرەکەی ((کەوتوو)) و ((کەتی)) دایە، واتا لە ((وو û )) و ((ی î )) دایە؛کە ئەمەش لە پاشگری نێوی بەرکار (اسم الفاعل) ی هەردوو شێوەکە دەچێ (تەماشای ل ١٠٣ بکە).

(ب) _لە دەمکاتی ئیحتیمالی دا

| کەتن | کەوتن |
|---|---|
| (bila) ez ketibim | (ba) kewtibim |
| (bila) tu ketibî | (ba) kewtibî(t) |
| (bila) ew ketibe | (ba) kewtibê(t) |

| كــــــــــه وتـــــــن | كــــــــــه تـــــــن |
|---|---|
| (ba) kewtibîn | (bila) em ketibin |
| (ba) kewtibin | (bila) hon ketibin |
| (ba) kewtibin | (bila) ew ketibin |

جیاوازییان ،تەنیا لە پاشــگری کەســی سێیەمی تاك وكەل دایـە. واتـــا لــە ( e و ê ) ( in و în ) دایــە،كە لەمەوبــەر باسمان كردوون .

( ٧ ) ــ لە دەمــی رابوردووی پێشووتردا ( صيغة الماضي الاسبــق pluperfect tense )

( أ ) ــ لە دەمكــاتــی ئاگاداری دا

| كــــــــــه وتـــــــن | كــــــــــه تـــــــن |
|---|---|
| (min) kewtibûm | ez ketibûm |
| (to ) kewtibûyit | tu ketibûyî |
| (ew ) kewtibû | ew ketibû |
| (ême) kewtibûyin | em ketibûn |
| (êwe) kewtibûn | hon ketibûn |
| (ewan) kewtibûn | ew ketibûn |

تــە نــیــا جیاوازییەك كــە لێرەدا ببینــرێ ؛ لە كەســی یەكەمــی كــە لــە دایـــــە ، واتــا لــە em ketibûn و ême kewtibûyin كە ئەوەش جیاوازییەكـی یەكجار كــەمــە .

( ب ) ــ لە دەمكــاتــی ئیحتیمــالــی دا

| كــــــــــه وتـــــــن | كــــــــــه تـــــــن |
|---|---|
| (ba) min kewtibûmaye | (bila) ez ketibiwama |
| (ba) to kewtibûytaye | (bila) tu ketibiwayî |
| (ba) ew kewtibûwaye | (bila) ew ketibiwa |
| (ba) ême kewtibûynaye | (bila) em ketibiwana |
| (ba) êwe kewtibûnaye | (bila) hon ketibiwana |
| (ba) ewan kewtibûnaye | (bila) ew ketibiwana |

ئــە وجیاوازی یــەی لێرەدا دەبینرێ،هەر لە بابە تــی ئەو جیاوازییە یــە كــە لــە دە مــی رابوردووی ناتــە واو ( دەمكــاتــی ئیحتیمالــی دا ) باسكراوە ( ل ٤١ )

( ج ) ــ لە دەمكاتــی رابوردووی پێشووتری تقريبی دا pluperfect/approximative

| كــــــــــه وتـــــــن | كــــــــــه تـــــــن |
|---|---|
| نـــــی یـــــە | ez diketibûm<br>tu diketibûyî |

| کەتن | کەوتن |
| --- | --- |
| ew diketibû<br>em diketibûn<br>hon diketibûn<br>ew diketibûn | نی یە |

ئەم دەمکاتە لە شێوەی ئەدەبیدا نی یە. جا لەبەر ئەوە دەبێ بە خەیاڵ کارێکی وەك (( دەکەوتبووم )) دروست بکەین و لێی وورد ببینەوە؛ بزانین چ دەورێکمان بۆ دەبینێ لە زمانە ئەدەبی یەکەماندا؛ ئەوجا بڕیار لەسەر وەرگرتن یا وەرنەگرتنی بدەین.

(٨) ـ دەمکاتی هاتوو (صیغة المستقبل future tense)

بە پێچەوانەی زمانی ئێرانیی کۆن و فارسیی نێوەڕاست (پەهلەوی) و فارسیی تازەوە کە کاری هاتوو یان پاراستووە، کرمانجیی نێوەڕاست؛ کاری هاتووی بەرداوە. لەبەر ئەوە کاری ڕانەبوردوو، لە جیاتی کاری هاتوو بەکار دێنێ و ئەمەش بۆ خۆی سەرلێ شێواندنێکی گەورەیە. بۆ وێنە کە گوتت: (( دەچم بۆ بازێر ))؛ لەوانەیە ئێستە بچیت، یا لە دوارۆژێکی نێزیك یا دووردا بچیت. واتا دەمکاتی کارەکەت دیار نی یە. بەلام کرمانجیی ژووروو ئەم خۆماڵە کۆنەی لەم دۆخانەی خوارەوەدا پاراستووە:

(أ) ـ لە دۆخی ئاگاداری دا

| کەتن | کەوتن |
| --- | --- |
| ez dêkevim<br>tu dêkevî<br>ew dêkeve<br>em dêkevin<br>hon dêkevin<br>ew dêkevin | نی یە |

لێرەدا پێشگری کاری ڕانەبوردوو (سابقة الفعل المضارع) کە (di-) یە؛ گۆڕا بە (dê-) و بەوە کاری ڕانەبوردوو بوو بە کاری هاتوو.

(ب) ـ لە دۆخی ئیحتیمالی دا

| کەتن | کەوتن |
| --- | --- |
| ez dê (ezê) bikevim<br>tu dê (tuê) bikevî<br>ew dê (ewê) bikeve<br>em dê (emê) bikevin | نی یە |

| کەتن | کەوتن |
|---|---|
| hon dê (honê) bikevin<br>ew dê (ewê ) bikevin | نی یە |

لەکۆتایی باسەکەدا نەختێك لە سەر دەمکاتی هاتوو دەدوێین.

(ج) ـ لە دۆخی مەرجی یەکەمدا (صیغة الشرط الاولی)

| کەتن | کەوتن |
|---|---|
| ezê (ez dê) biketama<br>tuê (tu dê) biketayî<br>ewê (ew dê) biketa<br>emê (em dê) biketana<br>honê(hon dê) biketana<br>ewê (ew dê) biketana | نی یە |

(د) ـ لە دۆخی مەرجی دووەمدا (صیغة الشرط الثانیة)

| کەتن | کەوتن |
|---|---|
| ezê (ez dê) ketibiwama<br>tuê((tu dê) ketibiwayî<br>ewê (ew dê) ketibiwa<br>emê (em dê) ketibiwana<br>honê(hon dê) ketibiwana<br>ewê (ew dê) ketibiwana | نی یە |

سەرنج : ئەم دوو دۆخەی سەرەوە ئەوەندە نزیکن لەیەکەوە، پیاو دەتوانێ بڵێ هەردووکیان بۆ یەك مەبەست بەکاردەهێنرێن.

(هـ) ـ لە دۆخی دەمکاتی هاتووی پێشوودا future/ anterior

| کەتن | کەوتن |
|---|---|
| ezê (ez dê) ketibim<br>tuê (tu dê) ketibî<br>ewê (ew dê) ketibe<br>emê (em dê) ketibin<br>honê(hon dê) ketibin<br>ewê (ew dê) ketibin | نی یە |

**سەرنج : ـ ئەم دۆخەی دووایی زۆر دەگمەنە، واتا کەم بەکاردەبرێ. چەند ووشەیەك لەبارەی دەمکاتی هاتووەوە:**

ئەم دۆخی کاری هاتووە کە بە (دێ dê) دەردەبڕێ، بنەڕەتەکەی بەتەواوی دیارنییە. بەلام بەبیری من، بۆ سەرچاوەی ئەم (دێ) یە دووجۆر لێکدانەوە هەیە:

(١) ـ یا بریتییە لەگەردانکردنی چاوگەی کاری ((ویستن)). چونکە گەردانکردنی ئەم چاوگەیە و بەکارهێنانی بۆ پێشاندانی کاری هاتوو، هێندێ جار لە کرمانجیی نێوەڕاستیشدا دەبینرێ. بۆ وێنە جاری وا هەیە کە بتەوێ لە پاشەڕۆژدا بچیت بۆ بەغدا دەڵێیت: ((دەمەوێ بچم بۆ بەغدا)). واتا بەکارهێنانی کاری ((دەمەوێ)) وای پێشان دەدەیت کە لە پاشەڕۆژدا (نەك ئێستە) دەچیت بۆ بەغدا. دەکاری هاتوو لە کرمانجیی ژووروودا، رەنگە هەر ئەم ((دەمەوێ)) یە بێ لە بنچینەدا. ئەوجا دەبێ بزانین کە ووشەی ((دەوێ)) بە کرمانجیی ژوورووو ((دڤی divê)) یە. کەواتە دەبێ ئەو ((dê)) یە لەم ((divê)) یەوە هاتبێ. واتا ((دڤێ)) بووە بە ((دێ)) و ((دێ)) ش بووە بە ((ئێ ê)). واتا بۆ وێنە ((ئەز دڤێ بچم)) بووە بە ((ئەز دێ بچم)) وئەوجا بووە بە ((ئەزێ بچم)). (٤٦)

ئا لەم رووەوە ـ ئەگەر ئەم لێکدانەوەیەی سەرەوە راست بێ ـ دەبینین فارسیی تازەش هەر ئەم رێیەی گرتووە بۆ داتاشینی کاری هاتوو. واتا دۆخی هاتوو (حالة المستقبل)ی لە چاوگەی کاری ((خواستن)) ـ واتا ((ویستن)) ەوە دروست کردووە. بۆ وێنە کە بڵێیت: ((من میروم)) واتا ((من دەڕۆم))، بەلام کە بڵێیت: ((من خواهم رفت)) واتا ((من دەمەوێ ـ لە مەولا ـ بڕۆم)). بە کورتی ((من بە تەمام بڕۆم)).

(٢) ـ یا بریتییە لە کەسی سێیەمی کاری ((هاتن)) کە ((دێ)) یە. واتا ئەوەی بە عەرەبی ((یأتی)) دەگرێتەوە. بەم جۆرە کە گوتت ((ئەز دکەڤم)) مانای ((انا اقعُ)) ـ واتا ((من دەکەوم)). بەلام کە گوتت ((ئەز دێ کەڤم)) ئەمە مانای ((انا یأتی "وقتٌ او یومٌ" اقعُ فیه)). واتا ((من "کاتێك" دێ کە دەکەوم)). بە کورتی: ((انا ساقعُ)) ی عەرەبی دەگرێتەوە.

ئەوەی شایانی باسە ئەوەیە، بوونی دەمکاتی هاتوو (صیغة المستقبل) لە زماندا، شتێکی زۆر پێویستە. لەبەر ئەوە وای بەباش دەزانم کە زمانی یەکگرتووی ئەدەبیی کوردی، ئەو دەمکاتە لە کرمانجیی ژووروو وەربگرێ. جا ئەگەر هیچ نەبێ دوو وێنەی: واتا لە دۆخی ئاگاداری و دۆخی ئیحتیمالی دا. ئەوەش بەم جۆرەی خوارەوە:

لە جیاتی ((من دەکەوم)) بنووسرێ ((ئەز دەکەڤم)).

لە جیاتی ((من بکەوم)) بنووسرێ ((ئەز بکەڤم)).

بەرامبەر ((ساقع)) ی عەرەبی ((ئەز دێ کەڤم)) بەکاربهێنرێ.

بەرامبەر ((اکون ساقع)) ی عەرەبی ((ئەز دێ بکەڤم)) یا ((ئەزێ بکەڤم)) بەکار بهێنرێ.

( ٩ ) ـ لە دەمی کاری فەرمانـدا (صيغة الامر) imperative mood

بۆ دروستکردنی کاری فەرمانی کارێکی تێنەپەڕ لە هەردوو شێوەکەدا؛ ڕەگی کارەکە وەردەگیرێ و پێشگری (( bi- )) ی دەخرێتە پێش و ( e ) ی دەخرێتە دوواوە . ئەم دەستوورەش لە هەردوو شێوە نێوبراوەکەدا وەك یەکە . بۆ وێنە دەگوترێ :

کەوتن ـ بکەوە ـ بکەون
کەتن ـ بکەڤە ـ بکەڤن

ئێستەش وا چەند نموونەیەك لە کاری فەرمانی کارە تێنەپەڕەکان دەخەینە روو :

| شێوەی نێوەڕاست | شێوەی ژووروو | کاری فەرمان |
|---|---|---|
| مردن | مرن | بمرە |
| چوون ( ٤٧ ) | چوون | بچە / ۆ / وو |
| دوون | ــــ | بدوو / ۆ |
| فڕین | فڕین | بفڕە |
| ڕۆیین | ــــ | بڕۆ |
| ــــ | کارین | بکارە |
| پرسین | پرسین | بپرسە |
| ــــ | هەرن ( ٤٨ ) | هەرە |
| بوون ( ٤٩ ) | بوون | ببە |
| پژان | ــــ | بپژێ |
| ــــ | پژین ( کولان ) | بپژە |
| بەزین | بەزین | ببەزە |
| گەڕان | گەڕیان | بگەڕێ /ە |
| ــــ | گەرین | بگەرە |
| وەرین | ــــ | بوەرێ |
| ــــ | وەرین ( هاتن )( ٥٠ ) | وەرە |
| گەیین | گەیین | بگە |
| سووتان | شەوتان | بسووتێ / بشەوتە |
| ڕژان | ڕژان | بڕژە / ێ |
| کولان | کەلان | بکولە / ێ |
| گریان/گرین | گرین | بگری |
| ژیان / ژین | ژین | بژی |

سەرنج ـ وەك دەبینین دەستووری سەرەوە لە هەردوولا وەك یەکە . هێندێ جار کاری فەرمان لە جیاتی بە ( e ) کۆتایی بێ ؛ یا بە ( ê ) یا بە ( î ) یا بە ( o ) یا بە ( û ) کۆتایی دێ . ئەمەش لە هەردوو شێوەکەدا هەیە و ئەو کارانەی کە بەم جۆرەن زۆر کەمن . بێجگە لەوەش لە هەردوو شێوەکەدا چەند کارێك هەن کە لە دەستوور بەدەرن ، بۆ وێنە :

| | | |
|---|---|---|
| گوتن | گۆتن | بلێ / بێژە |
| هێنتن | هێنتن | بهێڵە / بهێلە |

## ( ١٠ ) ـ كاری نا ی كاره تێنه‌پەڕەكان (صيغة النفی للافعا ل اللازمة)

دەمكاتی نا ی كاره تێنه پەڕەكان؛ له هەردوو شێوەكه دا وەك یەكن ( ١ ٥ ) وەك لەم لیستە یەی خوارەوەدا بۆ ماندەردەكەوێ كە كاری تێنه پەڕی ((كەوتن = كەتن )) له هه موو دەمكاتەكاندا وێنەی نا(النفی ) ) ی پیشان دراوە ٠

| دەمكات | كرمانجیی نیوەڕاست | كرمانجیی ژووروو |
|---|---|---|
| رانەبوردووی ئاگاداری | min dekewim<br>min nakewim | ez dikevim<br>ez nakevim |
| رانەبوردووی ئیحتیمالی | (ba) min bikewim<br>(ba) min nekewim | (bila) ez bikevim<br>(bila) ez nekevim |
| رانەبوردووی بەردەوامی ئاگاداری | niye<br>niye | ez dikevime<br>ez nakevime |
| رانەبوردووی بەردەوامی ئیحتیمالی | niye<br>niye | niye<br>niye |
| رابوردووی سادەی ئاگاداری | min kewtim<br>min nekewtim | ez ketim<br>ez neketim |
| رابوردووی سادەی ئیحتیمالی | niye<br>niye | niye<br>niye |
| رابوردووی ناتەواوی ئاگاداری | min (d)ekewtim<br>min ne(d)ekewtim | ez diketim<br>ez nediketim |
| رابوردووی ناتەواوی ئیحتیمالی | (ba)min bikewtimaye<br>(ba)min nekewtimaye | (bila) ez biketam(a)<br>(bila) ez neketam(a) |
| رابوردووی تەواوی ئاگاداری | min kewtûm<br>min nekewtûm | ez ketime<br>ez neketime |
| رابوردووی تەواوی ئیحتیمالی | (ba)min kewtibim<br>(ba)min nekewtibim | (bila) ez ketibim<br>(bila) ez neketibim |
| رابوردووی ناتەواوی پێشووتری ئاگاداری | min kewtibûm<br>min nekewtibûm | ez ketibûm<br>ez neketibûm |
| رابوردووی ناتەواوی پێشووتری ئیحتیمالی | (ba)min kewtibûmaye<br>(ba)min nekewtibûmaye | (bila) ez ketibiwama<br>(bila) ez neketibiwama |
| رابودووی پێشووتری تەقریبی | niye<br>niye | ez diketibûm<br>ez nediketibûm |

| دەمــکـــــات | کرمانجــــیی ناوەڕاســت | کرمانجــیی ژووروو |
|---|---|---|
| رابوردووی ناتەواوی بەردەوامی ئاگاداری | niye | ez diketime |
| | niye | ez nediketime |
| رابوردووی ناتەواوی بەردەوامی ئیحتیمالی | niye | niye |
| | niye | niye |
| دەمکاتی هاتــووی ســادە | niye | ez dêkevim |
| | niye | ez **nekevim** |
| دەمکاتی هاتووی سادەی ئیحتیمالــی | niye | ez dê(ezê)bikevim |
| | niye | ez dê(ezê)**nekevim** |
| دەمکاتی هاتووی مەرجی یــەکــەم | niye | ez dê(ezê)biketama |
| | niye | ez dê(ezê)neketama |
| دەمکاتی هاتــووی مەرجــی دووەم | niye | ez dê(ezê)ketibiwama |
| | niye | ez dê(ezê)neketibiwama |
| دەمکاتی هاتووی دۆخی پێــشــوو | niye | ez dê(ezê) ketibim |
| | niye | ez dê(ezê) neketibim |

(١١) ــ دۆخــی بــەرکـــاری participle (حالة المفعول) \

بینــای دۆخــی بــەرکـــاری ؛ لە هــەردوو شێوە بنچــینــەیی یەکەدا ، لــە یەکــدی جیاوازن . ئەم جیاوازی یەش لەوە وەها تووە کە دۆخــی بــەرکـــاری لە شێوەی ناوەڕاستدا،بە پاشگری (ڕاw/raw) و لە شێوەی ژووروودا بە پاشگری (ئــی î ) کۆتایــی دێ . لە شوێنێکــی دیشدا باســــی ئەمــە کراوە (ل ٣١) . بــۆ روون کردنــەوەی ئەمــەش وا لە خوارەوە چــەند نموونــەیــەك پێشان دەدەیــن :

| کـــــار | کــرمانجــیی ناوەڕاســـت | کرمانجــیی ژووروو |
|---|---|---|
| hatin | hatû | hatî |
| kewtin/ketin | kewtû | ketî |
| mirdin/mirin | mirdû | mirî |
| zan/zayîn | zaw | zayî |
| man | maw | mayî |
| bezîn/bezyan/bezha | bezîw | bezî/bezyanî/bezhanî(٥٢) |
| giryan/girîn | giryaw | girî |
| rewîn/revîn/revyan revhan | rewîw | revî/revyayî/revhanî(٥٣) |
| gutin | gutraw | gotî |
| kuştin | kujraw | kuştî |

| کـــــــــــار | کرمانجــی ی نێــو ەڕاســـت | کرمانجــی ی ژوو روو |
|---|---|---|
| bûn/bûyin | - bû (lexebayîbû) | bûyî |
| çûn/çûyin | - çû (ledestçû) | çûyî |

ســـەر نـــج ــ کارە تێنــەپەڕەکانــی دی ،وەك ئەوانــەی بە din- یا an- یا ûn- یا în- کۆتایــی یان دێ ،لە گەردانکــردندا ، هــە ر وەك کاری ((کــەو تــن = کەتــن )) ، لە هەردوو شێوەکەدا ،گەردان دەکرێــن ٠ لەبەر ئەوە دووبارەکردنەوەیانمان بە پێــو یســـــــت نەزانــی ٠ بێجگــە لەوەش تەنیا شتێــك کە لێرەدا بڵێیــن ئەوەیــە ئەو کارانەی کە بە تیپێکـــــی دەنگدار دەســت پــێ دەکــە ن لە شێوەی کرمانجــی ی ژووروودا ، وەك ( ئاڤێتــن = هاویشتن )، ئەو دەمــە ( i ) یەکەی پێشگری کاری رانەبوردوو کە ( di- ) یە دەکــەوێ و ئەو ( d ) یەی دەمێنێتــەوە تێکــەڵ بە تیپــی یەکەمــی کارەکــە دەبــێ،بەم جۆرەی خوارەوە :

ez davêjim...htd.

هێندێ کاریــش هــەن ،تاك هەڵکــەوتوون ،وەك (( ئانیــن = هانیــن = هێنان )) ٠ بــۆ وێنــە دەڵێیــت : ez ditînim ونالێیــت : ez dadanêm ٠ هەروەها هێندێ جار دەڵێیــت :ez têm ...htd. لەجیاتــی ez dêm...htd. و دەڵێیــت: ez têşiyan...htd. لەجیاتــی ez dêşiyam..htd. لە کاری (( هاتــن ) و ( ئێشان = یەشان ) دا٠

شایانــی باســە کە هێندێ کاری تێنەپەڕ هەن لە شێوەی ژووروودا ،وەك ( ئا خێڤــن ) و ( نێڕیــن )؛هــەرچەندە تێنەپەڕن،بەڵا م هــە ر بە پــێی دەستووری تێپــە ڕ،گەردان دەکرێن٠

ئەمجا ئێستــە پاش ئەوەی کاری تێنــە پەڕمان لە هەردوو شێوە سەرەکــی یەکەدا بەجوانی شی دکردەوە،دە بــێ بچینــە سەر گەردان کردنــی کاری تێپــە ڕ ٠ بەڵا م بەر لەوە دە بــــێ دەســت بــۆ چەنــد راستــی یەك درێــژ بکــە یــن :

( ١ ) ــ لە هەردوو شێوەکەدا کاری تێپــەڕ و تێنــەپەڕ لە دەمــی رانەبوردوودا وەك یــــە ك گەردان دەکرێــن ٠

( ٢ ) ــ لە شێوەی کرمانجــی ی ژووروودا کاری تێپــەڕ و تێنــەپــەڕ لە دەمــی رانەبــو ردوو و هاتــوودا وەك یەك گەردان دەکــرێــن ٠

( ٣ ) ــ کاری رابوردوو لە شێوەی ژووروودا ، تەنیا لەگەڵ جــێ نێوەکانــی دۆخــی خاوەنی دا ــ واتا : ---- min ,te ,wê/wî ,me ,we ,ewan(wan) گەردان دەکــرێــن ٠

جا لەبەر ئەوەی جیاوازی لە نێوان گەردان کردنــی کاری تێپــەڕ و تێنــە پەڕ دا،تە نیــا لە کاری رابوردوودایــە ، وا ئێمــە لێرەدا کاری ((کــڕیــن )) کە لە هەردوو شێوەکــە دا هــە ر ((کـــــڕیــن )) ە دەکەیــن بە نموونــە و لە هەموو دەمێکــی رابوردوودا گەردانی دەکەین

( ١ )ــ دەمی رابــوردووی سادە / دۆخــی ئاگاداری preterite/indicative

| کــرمانجــی ی نێــوەڕاســـت | کــرمانجــی ی ژوو روو |
|---|---|
| min kirîm | min kirî |
| to kirît | te kirî |
| ew kirî | wî/wê kirî |

| کرمانجیی ژووروو | کرمانجیی نێوەڕاست |
|---|---|
| me kir̂î | ême kir̂îman |
| we kir̂î | êwe kir̂îtan |
| ewan(wan) kir̂î | ewan kir̂îyan |

( ٢ ) ـ دەمی رابوردووی سادە / دۆخی ئیحتیمالی preterite/subjunctive

| کرمانجیی ژووروو | کرمانجیی نێوەڕاست |
|---|---|
| niye | niye |

سەرنج : تەنیا جیاوازییەك كە لە نێوانی هەردوو شێوەكەدا لە دۆخی رابوردووی سادەدا هەیە، ئەو جێ نێوە پێوە لكاوانەن كە لە شێوەی نێوەڕاستدا هەن و لە شێوەی ژووروودا نین ٠

(٣) ـ دەمی رابوردووی ناتەواو / دۆخی ئاگاداری imperfect/indicative

| کرمانجیی ژووروو | کرمانجیی نێوەڕاست |
|---|---|
| min dikir̂î | min demkir̂î |
| te dikir̂î | to detkir̂î |
| wî/wê dikir̂î | ew deykir̂î |
| em dikirî | ême demankirî |
| we dikir̂î | êwe detankir̂î |
| ewan(wan) dikir̂î | ewan deyankir̂î |

سەرنج : تەنیا جیاوازییەك كە لە نێوانی هەردوولا دا ببێ، هەر لە بوونی جێ نێوە پێوەلكاوەكاندایە لە شیوەی نێوەڕاستدا و نەبوونیان لە شێوەی ژووروودا ٠

( ٤ ) ـ دەمی رابوردووی ناتەواو / دۆخی ئیحتیمالی imperfect/subjunctive

| کرمانجیی ژووروو | کرمانجیی نێوەڕاست |
|---|---|
| (bila) min bikir̂ya | (ba) min bimkir̂yaye |
| (bila) te bikir̂ya | (ba) to bitkir̂yaye |
| (bila) wî/wê bikir̂ya | (ba) ew bîkir̂yaye |
| (bila) me bikir̂ya | (ba) ême bimankir̂yaye |
| (bila) we bikir̂ya | (ba) êwe bitankir̂yaye |
| (bila) ewan(wan) bikir̂ya | (ba) ewan biyankir̂yaye |

سەرنج : وەك دەبینین جیاوازی نێوانی هەردوو شێوەكە، لە بەكارهێنانی جێ نێوی پێوە لكاوەمیە كە باسمان كردووە لەوە پێش و هەروەها لە و پاشگرە وە یە كە ( -ye ) یە و شێوەی ژووروو بەكاری ناهێنێ ٠ ئەمەش وە نە بێ جیاوازییەكی گەورە و بنچینەیی بێ ٠

( ٥ ) ـ دەمی رابوردووی ناتەواوی بەردەوام — imperfect/ continuous

| کرمانجیی ژووروو | کرمانجیی نێوەڕاست |
|---|---|
| min dikir̂iye<br>... htd. | niye |

سەرنج : ئەم دەمکاتە کە لە شێوەی نێوەڕاست و زمانە ئەدەبی یەکماندا نی یە ؛ دەبێ بە وردی لێی بکۆڵینەوە، ئایا پێویستە وەری بگرین و ئەگەر وەرمان گرت، چۆن وەری بگرین •

( ٦ ) ـ دەمی رابوردووی تەواو / دۆخی ئاگاداری — perfect/indicative

| کرمانجیی ژووروو | کرمانجیی نێوەڕاست |
|---|---|
| (bila) min kir̂îbe | (ba) min kir̂îbêtim |
| (bila) te kir̂îbe | (ba) to kir̂îbêtit |
| (bila) wî/wê kir̂îbe | (ba) ew kir̂îbêtî |
| (bila) me kir̂îbe | (ba) ême kir̂îbêtman |
| (bila) we kir̂îbe | (ba) êwe kir̂îbêttan |
| (bila) ewan(wan) kir̂îbe | (ba) ewan kir̂îbêtyan |

سەرنج : دیسانەوە جیاوازی هەردوو لایان؛ هەر لە جێ نێوە پێوەلکاوەکاندایە •

( ٧ ) ـ دەمی رابوردووی تەواو / دۆخی ئیحتیمالی — perfect/ subjunctive

| کرمانجیی ژووروو | کرمانجیی نێوەڕاست |
|---|---|
| min kir̂îye | min kir̂îwme |
| te kir̂îye | to kir̂îwte |
| wî/wê kir̂îye | ew kir̂îwye |
| me kir̂îye | ême kir̂îwmane |
| we kir̂îye | êwe kir̂îwtane |
| ewan(wan) kir̂îye | ewan kir̂îwyane |

سەرنج : جیاوازی هەردوولا ، یەکەم : لە بەکارهێنانی جێ نێوی پێوەلکاوەوە یە لە کرمانجیی نێوەڕاست و بەکارنەهێنانێتی لە کرمانجیی ژووروودا • دووەم : لە پاشگری دۆخی کارایەتی ( حالة الفاعل ) دایە، کە لە کرمانجیی ژووروودا بە (-îy ) و لە کرمانجیی نێوەڕاستدا بە (-îw ) دەردەبڕێ •

( ٨ ) ـ دەمی رابووردووی پێشووتر ( صیغة الماضی الاسبق لە دۆخی ئاگاداری دا — pluperfect/indicative

| کرمانجی ژووروو | کرمانجی نێوەڕاست |
|---|---|
| min kirîbû | min kirîbûm |
| te kirîbû | to kirîbût |
| wî/wê kirîbû | ew kirîbûy |
| me kirîbû | ême kirîbûman |
| we kirîbû | êwe kirîbûtan |
| ewan(wan) kirîbû | ewan kirîbûyan |

سەرنج : وەك دەبینین، تەنیا جیاوازییەك كە هەبێ، وا لە بەكارهێنان و بەكارنەهێنانی جێ نێوە پێوەلكاوەكاندان دا.

( ٩ ) ـ دەمی رابوردووی پێشووتر ( صیغة الماضی الاسبق pluperfect/subjunctive لە دۆخی ئیحتیمالی دا

| کرمانجی ژووروو | کرمانجی نێوەڕاست |
|---|---|
| (bila) min kirîbiwa | (ba) min kirîbûmaye |
| (bila) te kirîbiwa | (ba) to kirîbûtaye |
| (bila) wî/wê kirîbiwa | (ba) ew kirîbûyaye |
| (bila) em kirîbiwa | (ba) ême kirîbûmanaye |
| (bila) we kirîbiwa | (ba) êwe kirîbûtanaye |
| (bila) ewan(wan) kirîbiwa | (ba) ewan kirîbûyanaye |

سەرنج : جیاوازی نێوانی هەردوو لا: یەكەم لە بەكارهێنان و بەكارنەهێنانی جێ نێوە پێوەلكاوەكانەوە دێ و دووەم لە بوونی پاشگری ( -ye ) لە شێوەی نێوەڕاست و نەبوونی لە شێوەی ژووروودا . لەگەڵ ئەوەشدا ئەم جیاوازییانە زۆر گەورە و گران نین .

( ١٠ ) ـ دەمی رابوردووی پێشووتری تەقریبی pluperfect/approximative

| کرمانجی ژووروو | کرمانجی نێوەڕاست |
|---|---|
| min dikirîbû<br>.... htd. | niye |

سەرنج : وەك دەبینین لە شێوەی نێوەڕاست و شێوەی ئەدەبیماندا ئەم دەمكاتە دەست ناكەوێ ، لەبەر ئەوە دەبێ بە وردی بیری لێ بكەینەوە، ئایا پێویستە ئەم دەمكاتە لە شێوەی ئەدەبیماندا ببێ و ئەگەر بە پێویستمان زانی، چۆنی وەربگرین .

دەمی هاتووی کاری تێپەڕ — future tense / transitive

( ١ ) ـ لە دۆخی مەرجی یەکەمدا — minê (min dê) bikiřiya

( ٢ ) ـ لە دۆخی مەرجی دووەمدا — minê (min dê) kiřîbiwa

سەرنج : وەك لەمەوپێش باسمان کرد، شێوەی کرمانجیی ناوەڕاست و لەو ڕێیەشەوە، شێوە ئەدەبیی یەکمان، دەمکاتی هاتووی نییە. ئەم دەمکاتە دەمکاتێکی زۆر پێویست و گرنگە. لەبەر ئەوە بە بیروڕای من، دەبێ ئەو دوو دۆخەی سەرەوەی ئەم دەمکاتە لە شێوە ئەدەبیی یەکمانـدا وەربگرین.

دەمکاتی فەرمانی کاری تێپەڕ

( ١ ) ـ بۆ دروستکردنی دەمکاتی فەرمان بۆ کارێکی تێپەڕی کە بە ( an ) یا ( în ) یا ( ûn ) تەواو ببێ، پاشکۆی کارەکە لا دەبرێ و ( bi- ) دەکرێتە پێشگر و ( e ) دەکرێتە پاشگری. ئەمەش هەر وەك کاری تێنەپەڕە و لە هەردوو شێوەکەشدا وەك یەکە. وا ئێستە لێرەدا چەند نموونەیەکیش بۆ ئەمە پیشان دەدەین :

| کرمانجیی ناوەڕاست | کرمانجیی ژووروو | کاری فەرمان |
|---|---|---|
| کڕین | کڕین | بکڕە |
| دڕین | دڕین | بدڕە |
| بردن | برن | بەرە / ببە |
| سڕین | سڕین | بسڕە |
| دان | دان | بدە |
| —— | کارین | بکارە |
| ڕوانین | —— | بڕوانە |
| | نێرین ( ڕوانین ) | بنێرە |
| —— | پژین ( کولاندن ) | بپژە |
| بینین / دیتن / دین | دیتن | ببینە |

( ٢ ) ـ هێندێ کار هەن کە لەم دەستوورە بەدەرن و ئەم بەدەرییەش لە هەردوو شێوەکەدا وەك یەکە. ئەو کارانە، دەمکاتە فەرمانییەکانیان یا بە ( û ) یا بە ( o ) یا بە ( ê ) کۆتایی یان دێ. بۆ وێنە : سوون ( سووتن ) ـ بسوو. جوون ( جووین، جووتن ) ـ بجوو. خواردن ( خوارن ) ـ بخۆ.

( ٣ ) ـ ئەو کارە تێپەڕانەی کە بە (-اندن andin-) کۆتایی یان دێ، دەمکاتی فەرمانیان لە شێوەی کرمانجیی ناوەڕاستدا بە ( êne ) و لە شێوەی کرمانجیی ژووروودا بە (îne) تەواو دەبێ. بۆ وێنە :

| کرمانجیی ناوەڕاست | کرمانجیی ژووروو | کاری فەرمان |
|---|---|---|
| خوێندن | خێندن | بخوێنە / بخێنە |
| ڕەواندن | ڕەڤاندن | بڕەوێنە / بڕەڤێنە |
| وەشاندن | وەشاندن | بوەشێنە / بوەشینە |
| ستاندن / سەندن | ستاندن | بستێنە / بستینە |
| ڕژاندن | ڕژاندن | بڕژێنە / بڕژینە |

سەرنج : هێندێ کار هەن، هەرچەندە بە (ین -în) تەواو دەبن، بەلام پەیڕەوی ئەم دەستوورەی سەرەوە دەکەن . بۆ وێنە:( ئانین = هانین ) بێنە / بینە .

( ٤ ) ـ ئەو کارە تێپەڕانەی کە بە ( -din ) کۆتایی یان دێ، دەمکاتی فەرمانیان بە زۆری بەم جۆرەی خوارەوەیە:

êre + ڕەگی کارەکە + bi

بۆ وێنە :

ژماردن ـ بژمێرە . ناردن ـ بنێرە .

( ٥ ) ـ کاری فەرمانی ئەو کارە تێپەڕانەی کە بە (تن -tin) کۆتایی یان دێ، بەوە دروست دەکرێ کە ( -tin ) لابرێ و لەجیاتی وی ( e ) دابنرێ. جا ئەگەر برگە (مقطع)ی دووەمی ڕەگی کارەکە ( a ) بوو، یا ( i ) بوو، ئەوا دەکرێ بە ( ê ) . بۆ وێنە :

بژارتن ـ بژێرە . ڕشتن ـ بڕێژە . پاراستن ـ بپارێزە . ئاخافتن ـ باخێڤە .

لێرەشدا دیارە کە لە هەردوو شێوەکەدا کاری وا هەن، کە لەم دەستوورە بەدەرن .

سەرنج : لە هەردوو شێوەکەدا کاری وا هەن، کاتێک کە دەمکاتی فەرمانیان لێ دروست دەکرێ، هێندێ دەنگەدەگۆڕێن بە دەنگی لە خۆیان نزیک، ئەمەش لە هەردوو شێوەکەدا وەک یەکە . بۆ وێنە :

ئاخافتن ـ باخێڤە . کوشتن ـ بکوژە . ڕشتن ـ بڕێژە . هاویشتن ـ بهاوێژە و ...هتد

بێجگە لەوەش هێندێ کار هەن لە شێوەی کرمانجیی ژووروودا، هەرچەندە کارە فەرمانی یەکانیان بە ڕاستی بەکاردەهێنرێن وماون، بەلام کارەکان خۆیان، بە پێچەوانەی شێوەی کرمانجیی نێوەڕاستەوە، لە سەر زمان سوواون. بۆ وێنە: فرۆتن ـ کوتن ـ ئاڤێتن ـ ڕیتن ـ مهتن؛ کە کارە فەرمانی یەکانیان ئەمانەن: بفرۆشە ـ بکوژە ـ باڤێژە ـ بڕێژە ـ بمێژە . کارە ڕاستەکانیان ئەمانەن: فرۆشتن ـ کوشتن ـ هاویشتن ـ ڕشتن ـ مژین .

بە کورتی: بینای کاری فەرمان، لە هەردوو شێوەکەدا، وەک یەکە و لە باری مۆرفۆلۆژی یەوە، جیاوازی یان لە نێواندا نی یە .

## کاری نای کارە تێپەڕەکان (صيغة النفي للافعال المتعدية)

بینای کاری نای کارە تێپەڕەکان، لە هەردوو شێوەکەدا وەک یەکن . وەک لەم ڕستانەی خوارەوەدا دەردەکەون :

anîn - meêne- meyene

avêtin- ez navêjim- min nahawêjim

şiştin- ew naşo - ew naşwa

şandin- bila neşîne- ba nenêrê

ez nan naxûm - min nan naxom

ew direw nekiribû- ew diroy nekirdibû

ez venaxwim- min naxomewe

min venedixwar- min nemdexuwardewe ( ٥٤ )

## دەمکاتی کارا نەزانراو (صیغة المجهول) passive voice

کرمانجیی نێوەڕاست دەمکاتی کارانەزانراو لە چاوگەی کارەوە وەردەگرێ. بۆ وێنە: چاوگەی کاری ((نووسین)) بەم جۆرەی خوارەوە دەکا بە دەمکاتی کارانەزانراو:

(١) ـ بۆ رابوردووی ناتەواو: نووسرا
(٢) ـ بۆ رابوردووی تەواو: نووسراوە
(٣) ـ بۆ رانەبوردوو و هاتوو: دە (ئە) نووسرێ
(٤) ـ بۆ رابوردووی سادە: دە (ئە) نووسرا

لە کرمانجیی ژووروودا، ئەم دەمکاتە بە هۆی کاری یارمەتیدەر (الفعل المساعد) ی ((هاتن)) ەوە دروستدەکرێ، کە دەخرێتە پێش چاوگەی کارەکەوە بۆ وێنە:

هات نڤیسین (واتا: هاتە نووسین) ـ بۆ رابوردووی ناتەواو
هاتیە نڤیسین (واتا: هاتووەتە نووسین) ـ بۆ رابوردووی تەواو.
دێ (تێ) نڤیسین (واتا: دێتە نووسین) ـ بۆ دەمکاتی هاتوو.

هەروەها دەگوترێ:

هات گرتن ـ هات دیتن ـ هات کوشتن ـ هات ئاڤا کرن. هات خوارن.
هاتی یە گرتن ـ هاتی یە دیتن ـ هاتی یە کوشتن ـ هاتی یە ئاڤا کرن ـ هاتی یە خوارن.
دێ (تێ) گرتن ـ دێ (تێ) دیتن ـ دێ (تێ) کوشتن ـ دێ (تێ) ئاڤاکرن ـ دێ (تێ) خوارن.

پێویستە بە لێدووان ناکا کە دارشتنی دەمکاتی کارانەزانراو لە شێوەی کرمانجیی نێوەڕاستدا، گەلێک هاسانترە لە هی کرمانجیی ژووروو. بێجگە لەوەش ئەم جۆرە دارشتنەی کرمانجیی نێوەڕاست نێزیکە لە دارشتنی دەمکاتی کارانەزانراو لە زمانی ئاڤێستادا. ئەمەش خۆی لە خۆیدا بەلگەیەکە بۆ کۆنیی ئەم جۆرە دارشتنە. لەبەر ئەوە ئەگەر شێوەی ئەم دارشتنە بەم جۆرەی خۆی بمێنێتەوە لە زمانە ئەدەبی یەکەماندا، چێترە.

## ئەنجام

ئێستە پاش ئەوەی کە سەرنجێکی باشمان لە کارەکانی زمانی کوردی، لە هەردوو شێوەکەدا وەرگرت، دیارە ئەم ئەنجامانەی خوارەوەمان دەستدەکەوێ:

(١) ـ کارەکانی زمانی کوردی، بەتایبەتی لە هەردوو شێوە سەرەکی یەکەدا، لە بارەی مۆرفۆلۆژی یەوە، جیاوازی یان لە نێواندا تەنی لەو رووەوە یە کە لە شێوەی کرمانجیی ژووروودا هێندێ دەمکات هەن، وەک دەمکاتی هاتوو و ... هتد کە لە شێوەی نێوەڕاست و زمانە ئەدەبی یەکەماندا دەستناکەون. ئێمە دەتوانین ئەم دەمکاتانە لە شێوەی ژووروو، بۆ زمانە ئەدەبی یەکەمان وەربگرین و زمانی نووسینمان بەوە دەولەمەندتر و فراوانتر بکەین.

(٢) ـ ئەو جیاوازی یە یەکجار کەمەی کە لە نێوان کارەکانی هەردوو شێوەکەدا لە باری لێکسیکۆلۆژی و فۆنۆلۆژی یەوە هەیە، بە وردی یە چارەسەردەکرێن کە لە بابەتی لێکسیکۆلۆژی و فۆنۆلۆژی دا باس کراون.

## ب ـ لە رووی فۆنۆلۆژی یەوە

فۆنۆلۆژی Phonology زانستی ناسینی دەنگەکانی زمان وجۆری دەربڕینیانە. جا ئەگەر لەم رووەوە تەماشای هەردوو شێوەکە بکەین، دەبینین؛ هێندێ جیاوازی لە نێوانیاندا هەیە. گرنگەکانیان ئەمانەی خوارەوەن:

### ١ ـ ((ل))ی قەڵەو

شێوەی کرمانجیی ژووروو ((لامی قەڵەو)) ی تێدا نییە. لە کاتێکدا لە شێوەی کرمانجیی نێوەڕاستدا ئەم ((ڵ))ە دەورێکی دیاری دەگێڕێ لە گۆڕینی مانای ووشەدا. بۆ وێنە: ئەگەر سەرنجی ووشەی (گول) و (گوڵ) یا (کەل) و (کەڵ) بدەین؛ ئەم جیاوازییەمان بەباشی بۆ دەردەکەوێ. (٥٥) بۆ چارەسەرکردنی ئەمەش چارنییە دەبێ ((ل))ی قەڵەو لە نووسینی زمانە ئەدەبییەکەماندا بمێنێتەوە. بەڵام هەرچییەکە وای بخوێنێتەوە وەك خۆی پێی خۆشە. بێجگە لەوەش باشترین شت ئەوەیە لیستەیەك بکەین بۆ ئەو ووشانەی دەنگی (ل) یان تێدایە و لە هەردوو شێوەکەدا یا وەك یەکن یا نزیکن لە یەکەوە، بەڵام لە کوردیی ژووروودا بە (ل)ی سووك و لە کوردیی نێوەڕاستدا بە (ل)ی قەڵەو دەردەبڕێن. ئەمجا لیستەیەکی دیش بۆ ئەو ووشانە بکەین کە (ل) یان تێدایە؛ بەڵام تەنیا لە یەکێك لە شێوەکاندا هەن؛ سا یا بە لامی قەڵەو یا بە لامی سووك دەردەبڕێن. هەروەها لیستەیەکی سێیەمیش بکەین بۆ ئەو ووشانەی کە لە هەردوو شێوەکەدا هەر بە (ل)ی سووك دەخوێنرێنەوە بەم جۆرەی خوارەوە:

| لیستەی یەکەم | | لیستەی دووەم | | لیستەی سێیەم | |
|---|---|---|---|---|---|
| گول | گوڵ | ـــ | کولتوڵ | شل (تمر) | شل (مائع) |
| دل | دڵ | ـــ | لێکۆڵینەوە | ل li | لە le |
| کەلاندن | کوڵاندن | ـــ | چێکلدانە | لاو | لاو |
| هلبژارتن | هەڵبژاردن | لەزین | ـــ | پیل | پەل |
| کال | کاڵ | بێڤل | ـــ | جلك | جلك (جل) |
| بلاڤ | بڵاو | ـــ | سکاڵا | | |
| هل ـ | هەڵ ـ | ـــ | مەل | | |
| پلاڤ | پڵاو | ـــ | پەلە | | |
| کەڤل | کەوڵ | بالیڤ | ـــ | | |
| گوپال | گۆپاڵ | ـــ | تەڵە | | |

سەرنج :ـ ستوونی راست لە لیستەی سەرەوەدا کرمانجی ژووروووە و ستوونی چەپیش کرمانجیی نێوەڕاستە.

ئەوەی شایانی باسە ئەوەیە کە ئەم لیستانە زۆر یارمەتیمان دەدەن، بۆ ئەوەی دەستوورێك بۆ بەکارهێنانی هەردوو جۆرە (ل)ەکە بدۆزینەوە. ئەم کارەش دیارە لێکۆڵینەوەیەکی تایبەتی پێویستە کە دەبێ باسێکی زانستانەی جیاوازی لە سەر بنووسرێتەوە. ئەمەی لێرەدا باسم کردووە تەنیا پێشنیازێکە بۆ ڕێبەدێیی کردن.

## ٢ - تیپی بێدەنگی « ر »

ئەو ووشانەی لە شێوەی نێوەڕاستدا تیپی (( ر )) یان تێدایە؛ ئەگەر هاتوو ئەو (( ر )) یە (( د )) ی لە پاشەوە هاتبوو، تیپی پێش (( ر )) کەش تیپێکی دەنگدار بوو؛ ئەوا لە شێوەی ژووروودا (( د )) کەی دەکەوێ. بۆ وێنە:

| کرمانجیی نێوەڕاست | | کرمانجیی ژووروو | |
|---|---|---|---|
| زەرد | zerd | زەر | zer |
| سارد | sard | سار | sar |
| ئارد | ard | ئار | ar |
| کێرد | kêrd | کێر | kêr |
| پرد | pird | پر | pir |
| کردن | kirdin | کرن | kirin |

لێرەدا دەبێ ئەوە رەچاو بگرین کە مانەوەی ئەو (( د )) یە لە زمانە ئەدەبی یەکەماندا شێوەی کۆنی زمانەکمان دەپارێزێ. جا لەبەر ئەوەی شێوەی نێوەڕاست تا ئێستە پاراستوویەتی؛ لابردنی بە شتێکی راست نازانم.

## ٣ - «د» ی کلۆر

شێوەی ژووروو و زۆربەی زۆری زاراواکانی شێوەی نێوەڕاست دەنگی ((دە de- )) یان (( د di- )) کە پێشگری کاری رانەبوردووە ( سابقة الفعل المضارع ) ە؛ دەپارێزن. بۆ وێنە دەنگی ( د ) لە کاری (( دەچم )) یا (( دچم )) دا؛ هەروەها دەنگی ( د ) کە دوا تیپی نێوێکی وەك ( ئەحمەد ) ە بە ئاشکرا دەردەبڕرێ. بەلام دەنگی ئەم ( د ) یە لە زاراوای سلەیمانی ـ ئەردەلاندا کلۆر دەبێ و بە جۆرێکی تایبەتی دەردەبڕرێ. جا لەبەر ئەوەی بە زۆری نووسەرەکانی کوردستانی عێراق، تا ئێستە زاراوای خەڵکی سلەیمانی یان کردووە بە بناخەی نووسینیان؛ (دە) ی پێشگری کاری رانەبوردوو بە چەشنی (( ئە )) دەنووسن، وەك ئەوەی لە جیاتی (( دەچم )) (( ئەچم )) دەنووسن. ئەم کارەش نەك تەنیا لە رووی زمانەوانی یەوە ناتەواوە، بەڵکو بە هۆی ئەوەوە کە ئەم (( د )) یە لە کوردی دا تازە کوورەیە، دیارە سەرلێ شێوانێکی زۆرە بۆ زۆربەی یەکجار زۆری کورد زمانان کە (( د )) ی کلۆر بەکار ناهێنن. لەبەر ئەوە فڕێدانی ئەم (( د )) ی کلۆرە؛ بە هەموو جۆرەکانی یەوە؛ هەنگاوێکی یەکجار باشە لە مەیدانی دامەزراندنی زمانی یەکگرتووی ئەدەبی دا. لێرەدا شایانی باسە، کە نووسەرەکانی کوردستانی عێراق، لەم دواییەدا هەوڵیان داوە لە گۆڤار و رۆژنامەکان و تەنانەت لە کتێبەکانی قوتابخانەکانیشدا؛ ئەم کارە پێکبهێنن، ئەگەرچی لە هەموو لایەکەوە بە تەواوی پێڕەویی نەکراوە. جا هەرچەندە کوردی کوردستانی ژووروو نالێن (( دەچم deçim )) بەڵکو دەڵێن (( دچم diçim ))؛ واتا ( دە de- ) دەبێتە ( د di- )؛ لەگەڵ ئەوەشدا بەکارهێنانی ( دە ) لە جیاتی ( ئە ) چوونە پێشەوەیەکی یەکجار مەزنە لەم رووەوە.

## ٤- «ڤ» و «و»

ئەم دوو دەنگە کە هەردووکیان دوولێوین bilabial (واتا بە هەردوو لێودەر دەبڕێن)؛ بە زۆری لە جیاتی یەکدی بەکاردەبرێن. لە کرمانجیی ژووروودا وەك (ڤ v) ولە کرمانجیی نێوەڕاستدا وەك (و w)؛ بەم جۆرەی خوارەوە:

| کرمانجیی نێوەڕاست | کرمانجیی ژووروو | کرمانجیی نێوەڕاست | کرمانجیی ژووروو |
|---|---|---|---|
| ئاو | ئاڤ | هاوین | هاڤین |
| تاو | تاڤ | نیو | نیڤ |
| ساوا | ساڤا | تەون | تەڤن |
| چاو | چاڤ | هەیو (٥٨) | هەیڤ |
| باوی (بادام) | باڤی | باو (ك) | باڤ |
| شوان | شڤان | هەوجار | هەڤجار |
| ئاوەژوو | ڤاژی | کەوڵ | کەڤل |
| گاو (٥٦) | گاڤ | تەوس | تەڤز |
| باو | باڤ | لاو | لاڤ |
| ناوك | ناڤك | لاو لاو | لاڤ لاڤك |
| وراوە (وڕێنە) | ڤراڤە | تەوێڵ | تەڤیل |
| کەوان | کەڤان | تەور | تەڤر |
| کەوانژەن | کەڤانژەن | هەنگوین | هەنگڤین / هەنگڤ |
| هەناو | هەناڤ | رایە | ڤابە |
| رێواس | رێڤاس | رێوی | رۆڤی |
| هیوا | هیڤی | بزوان | بزڤان |
| کەڤۆك (٥٧) ← | کۆتر → | گەلاوێژ | گەلاڤێژ |
| وێرا (بە موکری) | ڤێرا | وێکرا (بە موکری) | ڤێکرا |
| وێکەوتن (بە موکری) | ڤێکەتن | لێو | لێڤ |

بەلام دەبێ بزانین، کە ئەم دەستوورە گشتی نی یە، بەڵکو هێندێ جار (و w) لە کرمانجیی ژووروودا؛ هەر وەك خۆی دەمێنێتەوە. بۆ وێنە: ((ئاوا)) و ((وەرە)) لە هەردوو شێوەکەدا هەر بە ((و)) دەردەبڕێن. لەبەر ئەوە دەبێ بۆ ئەم دوو دەنگە ئی (و) و (ڤ) لیستەیەك بکەین تا بزانین لە چەند شوێندا (و) و (ڤ) لە جیاتی یەك بەکاردەبرێن و لە کوێدا (و w)، لە هەردوو لادا، وەك خۆی دەمێنێتەوە. ئەوجا لەوە دەستوورێك دەربهێنین و لەو جێیانەدا کە (و) ی کرمانجیی نێوەڕاست دەبێتە (ڤ) ی کرمانجیی ژووروو، هەمووی بە (ڤ) بنووسین. چونکە دەنگی (ڤ v) لە باری فۆنۆلۆژی یەوە کۆنترە لە (و w)، هەروەها لەسەر زمان شیرینتر و جوانترە و لەوەش بترازێ زۆربەی زۆری نەتەوەی کورد بەو جۆرە دەری دەبڕێ. ئەوجا کە بە (ڤ) نووسرا، هەر کەسە چۆنی دەردەبڕێ؛ ئەوە کەیفی خۆیەتی. واتا: ئاو ـ چاڤ ـ رێوی و... هتد بەم جۆرە: ئاڤ ـ چاڤ ـ رێڤی و... هتد بنووسرێن. ئەوسا یەکێك بە (ڤ) دەیخوێنێتەوە و یەکێکی دیش بە (و). ئەمەش بۆ ماوەیەکە. چونکە هێدی هێدی و پاش ئەوەی لە قوتابخانەکاندا

بەو جۆرە فێری منالّ کرا، دەنگی (ڤ) دەبێتە دەنگێکی تێکرایی لە زمانی نووسینماندا.

هەرچەندە جارێ نامەوێ دەستوورێکی گشتی، بەم کوتوپڕییە، بۆ ئەم دەنگە دابنێم، چونکە ئەو باسە لێکۆڵینەوەیەکی تایبەتی پێویستە کە هێشتا پەیوەی خەریکم، لەگەڵ ئەوەشدا دەتوانم بڵێم؛ یەکێک لە بنچینەکانی ئەم دەستوورە ئەوەیە؛ بەزۆری کە تیپی ((و)) لە کرمانجیی نێوەڕاستدا؛ پاش یا پێش تیپێکی دەنگداری درێژی وەك (ا a) یا (ی î) یا (ێ ê) بێ، ئەوا ئەو ((و))ە؛ لە کرمانجیی ژووروودا دەبێتە (ڤ). بۆ وێنە: (ئاو) دەبێتە (ئاڤ)؛ (چاو) دەبێتە (چاڤ)؛ (بلاو) دەبێتە (بلاڤ)؛ (هاوین) دەبێتە (هاڤین)؛ (هیوا) دەبێتە (هیڤی)؛ (ڕێوی) دەبێتە (ڕۆڤی)؛ (هەنگوین) دەبێتە (هەنگڤین). ژمارەیەکی یەکجار کەم نەبێ کە لەم دەستوورە دەردەچن، ئەوانی دی هەموو بەو جۆرەی سەرەوەن.

ئەوەی شایانی باسە ئەوەیە؛ ئەم (و w)ەی شێوەی کرمانجیی نێوەڕاست، لە دەنگی (واو)ی عەرەبی ناچێ. (و w)ی کوردی بە دوولێو دەردەبڕێ، لە کاتێکدا (و)ی عەرەبی بە مەلاشوو دەردەبڕێ. بۆ وێنە: سەرنجی ووشەی (قَوْلْ)ی عەرەبی و (کەو)ی کوردی بدەن. هەروەها سەرنجی (و w)ی ووشەی (کەو) لەگەڵ (و w)ی ووشەی (وەرە) بدەن، دەبینن لەیەك ناچن. دەنگی (و)ی (کەو) لە دەنگی (ڤ)وە یەکجار نێزیکە و بگرە یەکە و دوولێوییە. بەلام (و)ی ووشەی (وەرە) تیپێکە لە جۆرێکی دی.

جا بەر لەوەی کۆتایی بەم باسە بهێنم، دەمەوێ سەرنجی خوێنەرەوە بۆ چەند ڕاستییەك ڕابکێشم:

١ ـ نابێ ئەوەمان لەبیر بچێ کە (ڤ) لە هێندێ لە زاراواکانی شێوەی کرمانجیی ژووروودا هەر بەرامبەر (و)ی کرمانجیی نێوەڕاست نییە. بەڵکو هێندێ جار بەرامبەر بە (ب)یشە. بۆ وێنە:

| ڤەراڤەر | لەجیاتی | بەرامبەر |
| --- | --- | --- |
| ڤاران | = | باران |
| زڤر | = | زبر |
| ڤادار | = | بادار |
| تەڤایی | = | تەبایی |
| ڤەرڤە | = | بەفر |
| باڤ | = | باب |

ڕاستی یەکەی ئەوەیە (ڤ) لە کوردیدا لە (ب) ڕەسەنترە، لەباری فۆنۆلۆژییەوە.
هیچ دوور نەڕۆین! (بەرامبەر) لە بنەڕەتدا (بەراو بەر)ە. (بەفر) بە زمانی ئاڤێستایی (ڤەفرە)یە. (با) بە ئاڤێستایی (ڤەیە)یە و (باران) (ڤار)ە.
لەبەر ئەوە ئەم (ڤ) یەکە لە کوردیی نووسینماندا (ب)یە؛ لە (ب) یەکە ڕاستترە.
بێجگە لەوەش بەڵگەیەکی دی هەیە، ئەوەش ئەوەیە کە شێوەی موکری لە زۆر شوێندا (ب) وەك (و) لێ دەکا؛ کە (و)یش شێوەیەکی قورسی (ڤ)یە. بۆ وێنە:

| وەدەست کەوتن | لەجیاتی | بەدەست کەوتن |
| --- | --- | --- |
| وەدووکەوتن | = | بەدووکەوتن |
| وەدی هێنان | = | بەدی هێنان |
| وەڕاست گێڕان | = | بەڕاست گێڕان |

بێجگە لەوەش لە گەلێک لە زاراواکانی شێوەی کرمانجیی نێوەڕاستدا؛ (ب) دەبێتە (و).

بۆ وێنە: (بەرخ) و (بووك) و (باران بارین) و (سەربازا)؛دەبنە: (وەرە) و (وەوی) و (واران وارین) و (سەر واز) و هتد. لەمەش بترازێ، سروشتی زمانی کوردی وایە کە تەنانەت هێندێ لەو ووشە بێگانانەی وەریان دەگرێ و (ب) یان تێدایە،دەنگی (ب) یەکە دەکاتە (و). بۆ وێنە: "زەبت (الضبط)"ی عەرەبی دەکاتە (زەوت) ـ سەرنجی ووشەی "زەوتکردن" بدەن. هەروەها (صبی) یش دەکاتە (ساوا).

٢ ـ ئەوەشمان نابێ لە بیر بچێ کە هێندێ ووشەی کرمانجی ی ژووروو هەن؛ دەنگی (ڤ) یان تێدایە، بەڵام بەرامبەرەکانیان لە کرمانجی ی نێوەڕاستدا دەست ناکەون. وەك:

"ڤرکەر" (درۆزن)، "ڤر" (درۆ)، "پەیڤین" (قسەکردن)، "کەڤر" (بەرد)، تەڤ" (هەموو)، "تەڤگەر (حَيّز)" "بێڤل" (لووت) "ڤێڤرین" (دەرکەوتن)، "ڤرچالە" (ترسنۆك)، "خیڤە" (نۆبەرە)، "بالیڤ" (سەرین).

٣ ـ دیسانەوە دەبێ ئەوەش بێنینە بەرچاومان کە زۆربەی زۆری ئەو ووشانەی لە کرمانجی ی ژووروودا دەنگی (و w) یان تێدایە؛ لەو ووشانەن کە دەنگی (خ x) ـ کە دەنگێکی گەرووی یە ـ لە سەرەتایانەوە دێ. وەك: خوەستن، خوەش، خوە، خوەردیان (٥٩) خورنووف (خرنووك). ئەم دەنگی (و w) یە لە کرمانجی ی نێوەڕاستدا؛ بە زۆری بووە بە ((ۆ o)) وەك "خۆش" "خۆ" ... هتد.

## ٥ ـ پاشکۆی "دن" و "تن" suffix "-din" and suffix "-tin"

هێندێ چاوگەی کار هەن کە لە شێوەی نێوەڕاستدا بە پاشکۆی ((دن -din)) کۆتایی یان دێ، کەچی لە شێوەی کرمانجی ی ژووروودا بە ((تن -tin)) کۆتایی یان دێ. بۆ وێنە:

| کرمانجی ی نێوەڕاست | کرمانجی ی ژووروو |
|---|---|
| ژماردن | ژمارتن |
| هەڵبژاردن | هلبژارتن |
| هە(ناردن) | هنارتن |
| برژاندن | براشتن |

ئەم پاشکۆیە ((تن))، لە شێوەی ژووروودا، دەستوورێکی گشتی ی نی یە. واتا تەنیا ژمارەیەکی زۆرکەمی کارەکان لەم جۆرەن. لەبەر ئەوە، ئەگەر ئەم پاشکۆیە ((تن)) بۆ ئەو چەند کارە کەمە، لە زمانی ئەدەبیشماندا؛ جاروبار بەکاربرێ، زیانێك ناگەیەنێ.

## ٦ ـ دەنگی "ژ" و "ز"

زمانی کوردی، بە پێچەوانەی زمانی فارسی ی تازەوە، دەنگی ((ژ)) ی کۆنی پاراستووە. لەوانەیە ((ژ)) لە ((چ)) یا ((ج)) ی ئاڤێستایی یەوە هاتبێ و لە کوردی دا ـ وەك فارسی ی نێوەڕاست (پەهلەوی) بووبێ بە (ژ) و لە فارسی ی تازەشدا بووبێ بە ((ز)). ئەم (چ) ی ئاڤێستایی یە؛ ئێستەش لە هێندێ ووشەی کوردی دا بە تەواوی وەك خۆی پارێزراوە. بۆ وێنە: سەرنجی ووشەی ((بەرۆچکە beȓoçke)) ی کوردی بدەن و لەگەڵ ووشەی ((راۆچاه raoçah)) ی

ئاڤێستایی کە مانای ((ڕۆژ)) ە بەراورد بکەن. هەروەها سەرنجی ووشەی (ڕۆچیار) کە نێوی فریشتەیەکە لەلای ((ئەهلی هەق)) (٦٠) وردیارە بە مانای ((ڕۆژیار))ە، بدەن. وا لە خوارێشەوە چەند ووشەیەکی لەم بابەتەی زمانی کوردی لەگەڵ فارسی ی تازەدا، لەم ڕووەوە بەراورد دەکەین:

| فارسی ی تازە (٦١) | | کوردی | |
|---|---|---|---|
| زن | zen | ژن | jin |
| زنگ | zeng | ژەنگ | jeng |
| زانو | zanû | ژنۆ، ئەژنۆ | jino, ejno |
| روز | rûz | ڕۆژ | roj |
| بازار | bazar | بازێڕ | bajêr |
| زیر | zîr | ژێر | jêr |
| زدن (لێدان) | zeden | ژەندن | jendin |
| زیستن | zîsten | ژین | jîn |
| از | ez | ژ ji (واتا "لە" بە ئاڤێستایی haça) | |
| تیز | tîz | تیژ، تێژ | tîj, têj |

بەڵام هێندێ ووشەی کوردی هەن، بەتایبەتی لە شێوەی نێوەڕاستدا، کە وتوونەتە ژێر تاوی فارسی ی تازەوە و دەنگی ((ژ)) کەیان بووەتە ((ز)). بۆ وێنە: دڵسۆز، زیرەك، نەورۆز، بازاڕ، زرنگ. لە کاتێکدا ((ژ))ی ئەم ووشانە لە شێوەی کرمانجی ی ژووروودا، هەر وەك خۆی ماوەتەوە. بۆ وێنە: دڵسۆژ، ژیرەك، بازێڕ، ژرەنگ.

بەلای منەوە واباشە، هەموو ئەو ووشانەی کە لەم بابەتەن، واتا دەنگی (ژ) یان وون کردووە، جارێکی دی، دەنگە ڕاستەکەی خۆیان پێ بدەینەوە. واتا لە جیاتی ووشەی (زیندوو)، (زەهر)، (دۆزەخ)، (حەز) و ... هتد، ووشەی ژیار، ژار، دۆژە ـ کە ووشەیەکی کرمانجی ی ژووروووە و وێنەیەکی یەکجار کۆنی ووشەکەیە ـ، هەژ (کرمانجی ی ژووروووە) بەکار بهێنین. شایانی باسە کە زۆربەی زۆری ئەو ووشانەی لەم بابەتەن، وێنە ڕاستەکەیان لە کرمانجی ی ژووروودا دەست دەکەون.

## ٧ ـ دەنگی "ش" و "ژ"

لە شێوەی کرمانجی ی نێوەڕاستدا، هێندێ جار لە جیاتی ووشەی (دیسانەوە) یا (هەروەها) تیپی پێوەندی (حرف الجر)ی ((یش)) بەکار دەبرێ. بۆ وێنە: لە جیاتی ((هەروەها من)) دەڵێن ((منیش)). ((یش)) ئەگەر پاش تیپێکی دەنگدار بێ، بە زۆری دەبێتە ((ش)). بۆ وێنە: ((کتێبەکە)) دەبێتە ((کتێبەکەش)). بەڵام لە شێوەی کرمانجی ی ژووروودا، ئەم ((یش))ە پێچەوانە دەبێتەوە و دەبێ بە ((ش)) و ((شـ))ەکەش دەنگەکەی نازکتر دەبێتەوە و دەبێتە ((ژ)). واتا لە جیاتی ووشەی ((کتێبیش)) دەگوترێ ((کتێب ژی)). بێجگە لەوەش، هێندێ جار، دەنگی ((ش)) لە ووشەیەکدا دەبێتە ((ژ))، وەك ((مێشك)) دەبێتە ((مەژی)).

لێرەدا پێویستە بزانین کە ((ژ)) و ((ش))، دوورنی یە هەردووکیان لە ((ز))ی ئاڤێستایی یەوە هاتبن. بۆ وێنە (مەژی) ـ واتا (مێشك) بە

کرمانجی ی ژووروو، بە ئاڤێستایی ((مازگا)) یە. هەروەها ((ژی jî-)) ی کرمانجی ی ژووروو، بە مانای ((پش = دیسانەوە))، بە ئاڤێستایی ((زی zî-)) یە. لە بەر ئەوە دەنگی ((ژ)) و ((ش)) هەردووکیان لە باری فۆنۆلۆژی یەوە، یەك نرخیان هەیە. بۆیە گۆڕینی (ش) بە (ژ) بە کارێکی بەجێ نابینم.

## ٨ـ پاشگری "گا" و "گە" suffix "-ga" and suffix "-ge"

لە شێوەی کرمانجی ی ناوەڕاستدا (گا -ga) و (گە -ge)، هەر دووکیان وەك پاشگر، دەچنە دوایی ی (ناو) و (چاوگەی کار)، وە وەدەبنە (ناوی جێ ـ اسم المکان)، وەك: زانستگا (زانستگە)، لە شکرگا (لە شکرگە)، دووانگا (دووانگە)، ڕۆنگا (ڕوانگە). بەڵام لە شێوەی کرمانجی ی ژووروودا، بە زۆری، هەر (گە) بە کار دەهێنرێ، نەك (گا)، وەك: زانگە، تاڤگە، خوەندنگە.

بە بیروڕای من، لە زمانی کوردی ی ئەدەبیدا، هەر تەنیا پاشگری ((گە)) بە کار بهێنرێ باشترە. چونکە هیچ شتێکی تازەی نە ناسراو ناخرێتە زمانەکەوە و لەگەڵ ئەوە شدا، ئەو جیاوازی یەی لەگەڵ شێوەی ژووروودا هەیە لەم ڕووەوە، نامێنێ.

## ٩ـ دەنگی "ئۆی" (ö)

ئەم دەنگە کە لە هێندێ زاراوای کرمانجی ی ناوەڕاستدا هەیە، وەك زاراواکانی سلێمانی، کەرکووك، ئەردەلان، موکریان، دەنگێکە هەتا ئێستە بە تەواوی ساخ نەبووەتەوە کە لە چی یەوە هاتووە. هێندێك لە زاناکانی زمانەوانی کە لە سەر ئەم دەنگەیان نووسیوە، دەڵێن گوایە دەنگی "ئۆی" (ۆ ö) لە وشەی "خوێن و شوێن و نوێن و سوێنە و ... هتد" دا؛ لەوانەیە لە بنەڕەتدا؛ لە ژێر تاوی زمانی تورکی دا، خۆی هاویشتبێتە ناو کوردی یەوە. واتا گۆڕانەکە بەم جۆرەی خوارەوە ڕووی داوە:

خوون > خۆن > خوێن
شوون > شۆن > شوێن

ئەوەش دەبێ بزانین کە هێندێ وشەی تورکی هەن کە (ئۆی ö) یان تێدایە و لە کوردی دا بەکار دێن، دەنگی (ئۆی ö) کەیان دەبێتە (ۆ o)، بۆ وێنە:

سوێز söz دەبێتە soz (لە کرمانجی ی ژووروودا ـ مانای بەڵێن)ە.
دوینیوم dönüm دەبێتە دۆنم donim

بێجگە لەوەش ئەم (ئۆی) یە لە هێندێ زاراوای کرمانجی ی ناوەڕاستدا بە کار نابرێ. بۆ وێنە لە زاراوای هەولێردا بە ((خوێن)) دەڵێن ((خوون)) هەروەها وشەی (دوێنێ) لە هێندێ زاراوا دا دەبێتە (دۆ do).

هەرچی چۆنێك بێ؛ هێشتا ئەم باسە بە ئەنجام نەگەیشتووە. لە بەر ئەوە جارێ ناچارین؛ هەموو شێوەکانی ئەو وشانە بە کاربەرین. بەڵام ئەوەی ئاشکرایە؛ ئەگەر بێتو ئەم وێنە یە (واتا ئەم وێنە دەنگی یە) لە زمانە ئەدەبی یەکەماندا لا بچێ، لە کاتێکیشدا کە زۆربەی زۆری کورد زمانان نان بە کاری ناهێنن، دیارە هیچ زیانێك بە زمانی نووسینمان ناگەیەنێ، بەڵکو دەنگێك لە ئەلفوبێکەمان کەم دەکاتەوە و زمانەکەمان سووکتر دەکا، بەوەی کە دەنگێکی لە سەر زمان گران؛ ناهێڵێ.

## ١٠- دەنگی (ص)

دەنگی ((ص)) لە هێندێ وشەی چەند زاراوایەکی کرمانجیی نێوەڕاست و ژووروودا دەبیسترێ. بۆ وێنە: لە کرمانجیی نێوەڕاست - بەتایبەتی لە زاراوای سلەیمانی و ئەردەڵاندا - وشەی ((صەگ)) و ((صەد)) و ((شانص)) و ((شەصت)) و ((صەوز)) و ... هتد لە جیاتی ((سەگ)) و ((سەد)) و ((شانس)) و ((شەست)) و ((سەوز)) و ... هتد دەبیسترێن. هەروەها لە کرمانجیی ژوورووشدا، وشەی ((صال)) و ((صار)) و ... هتد لە جیاتی ((سال)) و ((سار - واتا "سارد")) بەکار دێن.

دەنگی "ص" لە کوردیدا، ئەگەر لە وشەیەکدا نەبێ کە لە زمانێکی بێگانەوە - بەتایبەتی لە عەرەبییەوە - وەرگیرابێ، بە زۆری لەوەوە دێ، کە کاتێک دەنگی ((س)) پێش تیپێکی دەنگدار دەکەوێ، ئەگەر بێتو هەر وەك ((س)) دەربڕدرێ، ئەوا لەسەر زمان ناخۆش دەردەچێ. بۆ وێنە: هەوڵ بدە بڵێیت: ((سەگ)) و ((سەد)) و ((شانس)) و ((شەست)) و ((سەوز))، ئەوسا دەبینیت کە لەسەر زمانت چەند ناخۆشتر دێن لەوەی بڵێیت: ((صەگ)) و ((صەد)) و ((شانص)) و ((شەصت)) و ((صەوز)). ئەم دەنگگۆڕینە کە لێرەدا دەیبینین، گۆڕانێکی ئاسایی یە و بەسەر هەموو زمانێکدا خۆی دەسەپێنێ و دەستوورێکی تایبەتی هەیە کە لە زانستی زمانەوانیدا پێی دەڵێن ((دەستووری دەنگگۆڕین)). پوختەی ئەم دەستوورەش ئەوەیە، هەر کاتێك دەنگێك لەسەر زمان ناخۆش و گران بوو، بە هۆی چوونە پاڵی دەنگێکی دییەوە کە لەگەڵی نەسازێ، ئەو دەمە ئەو دەنگە دەگۆڕێ بە دەنگێکی نزیك لە خۆی، بەڵام خۆشتر لەسەر زمان.

ئێستە با واز لە کوردی بهێنین و جارێ نموونەیەکی ئەم گۆڕانە لە زمانی عەرەبیدا پیشان بدەین. دەبینین وشەی ((ثلاثة)) لە عەرەبیدا و بەتایبەتی بۆ هێندێ لە عەرەب زمانان، دەربڕینی گرانە. لەبەر ئەوە دەبینین ئەم وشەیە لە زاراوای میسریدا بووە بە ((تلاتة))... چونکە دەنگی ((ت)) یەکێکە لە دەنگە نزیکەکان بە ((ث)) وەکو ((ث)) دەربڕینی لەسەر زمان گران و ناخۆش نییە. هەروەها دەبینین ئەگەر کوردێك عەرەبی باش نەزانێ و وشەی ((ثلاثة)) بڵێ، دەست بەجێ دەڵێ ((سەلاسە)). چونکە دەنگی ((س))یش دەنگێکی نزیکە لە ((ث)) و، بەڵام وەکو ((ث)) لەسەر زمان نارەحەت نییە. هەر لەبەر ئەوەشە ئەم دەنگی ((ث))یە کە لە زمانە ئێرانییە کۆنەکاندا (وەبەتایبەتی لە زمانی ئاڤێستادا) هەبووە و ئێستەش پاشماوەی لە زاراوای هەورامانیدا ماوە، لە کوردیی ئەمڕۆدا بووە بە ((ت)) و لە فارسیی تازەشدا بووە بە ((س)). بۆ وێنە: ئێستەش بە زاراوای هەورامانی بە ((تێر)) دەڵێن ((ثێر)) یا ((سێر)) کە بە فارسی ((سیر))ە. واتا زمانی فارسیی تازە دەنگی ((ث))ی کردووە بە ((س)) و زمانی کوردیی تازە ((ث))کەی کردووە بە ((ت)). ئەم دەستوورە بۆ وشەی بێگانەش هەر وایە. بۆ وێنە: وشەی ((أَثَرْ))ی عەرەبی لە فارسیدا وەك ((اَسَرْ)) دەردەبڕدرێ، بەڵام لە کوردیدا بووە بە ((ئەتەر)) و ئەوجا ((هەتەر)) - دەڵێ: هەتەریان نەهێشت -. هەروەها وشەی ((مَثَلْ))ی عەرەبی، لە فارسیدا وەك ((مَسَلْ)) دەردەبڕدرێ، بەڵام لە کوردیدا بووە بە ((مەتەڵ)). تەنانەت کوردەکانی ژووروو بە ((پەندی پێشینان)) کە بە عەرەبی ((حِكَمْ و امثال)) و بە فارسی ((ضَرْبُ المَثَلْ))ی پێ دەڵێن، دەبێژن ((مەتەلۆك metelok)) کە لە ((مەتەل + ۆك))ەوە هاتووە. ((ۆك -ok))، لێرەدا نیشانەی گچکە کردنەوەیە.

نموونە یەکی دی ئەم دەنگ گۆڕینە لە دەنگی ((ب)) ی زاراوای سلەیمانی دا دەبینین. بۆ وێنە کاتێك دەنگی ((ب)) لە کارێکی فەرماندا پێش تیپێکی دەنگدار و دەنگێکی فیکەیی (وەك "س" و "ش")، یا دەنگێکی دانی (وەك "چ" و "ت") یا دەنگێکی مەلاشوویی ـ گەروویی (وەك "ك" و "خ" و "ق") بکەوێ، دەبێتە ((پ)). بۆ وێنە:
لە جیاتی: "بسوو"، "بشۆ"، "بچۆ"، "بتۆرێ"، "بکە"، "بخۆ" "بقە پێنە" (٦٢)
دەگوترێ: "پسوو"، "پشۆ"، "پچۆ"، "پتۆرێ"، "پکە"، "پخۆ"، "پقە پێنە" (٦٣)

بە کورتی و لەبەر ڕۆشنایی ئەم روون کردنەوەیەی سەرەوە دا، چونکە دەنگی (ص) لە کوردی دا گشتی و خۆیی نی یە، دەبێ بخرێتە پشت گوێ و ئەو وشە کوردی یانەی لەم بابەتە شن، هەر دەبێ بە ((س)) بنووسرێن و چۆن دەردەبڕرێن، خەم ناکا.

## ١١- دەنگی (ط) و (ظ)

لە هێندێ زاراوای شێوەی کرمانجی ی ژووروودا (بە تایبەتی زاراوای بادینان)، چەند وشەیەکی کەم بەرچاو دەکەون کە لە شێوەی نێوەڕاست و ژێروو و لاتەنیشتەکاندا بە (ت) و (ز) دەردەبڕرێن، کەچی لەو زاراوانەدا دەبنە (ط) و (ظ). ئەوەی شایانی باسە ئەوەیە، ئەم دوو دەنگە لە زمانە ئێرانی یەکاندا ـ بە تایبەتی لە زمانە ئێرانی یە کۆنەکاندا ـ نەبووە. هەروەها وەنە بێ لە هەموو زاراواکانی شێوەی ژووروشدا شتێکی گشتی و باو بێ. بێجگە لەوەش ئەم دوو دەنگە بێگانەیە لەو زاراوانەدا، نابێتە هۆی ئەوەی نرخی مانای وشەکە بگۆڕێ ـ وەك (ل) ی قەلەو و (ڕ) ی قەلەو دەیگۆڕن. بۆ وێنە (زەلام) و (ظەلام) هەردووکیان هەر (زەلام) ن. (طاڤگە) و (تاڤگە) هەردووکیان هەر (تاڤگە) ن. (طاوە) و (تاوە) هەردووکیان هەر (تاوە) ن. (ظۆر) و (زۆر) هەردووکیان هەر (زۆر) ن. لە کاتێکدا ـ وەك دیمان ـ (کەر) و (کەڕ) یا (کول) و (کوڵ) یەك نین.

لە بەر ئەوە ئەم دوو دەنگە (ط) و (ظ)، بە هیچ جۆرێك لە باری سەرنجی فۆنۆلۆژی یەوە بایەخیان پێ نادرێ. وە هەر بەو پێ یەش تیپێکی تایبەتی بۆ هیچ کامێکیان لە زمانە ئەدەبی یەکەماندا دانانرێ.

## ١٢- دەنگی (ك) و (گ) لە دۆخێکی تایبەتی دا

کاتێك تیپی بێ دەنگی (ك) و (گ) لە وشەیەکدا پێش هێندێ تیپی دەنگدار بکەوێ، بە تایبەتی (ئی î) و (ئێ ê) و (ئوێ ö) ئەو کاتە دەنگەکانیان نەختێك نازك دەبێتەوە و لە دەنگی (چ) کە دەنگێکی دانی یە، نزیك دەبێتەوە. بۆ وێنە ئەم وشانە کیلۆ، کیسە، کیژ، کێرد، کول، کێش، کوێستان، کێو، کوێ. هەروەها گیرە، گیسك، گێرە، گێژ، گوێ، گوێسوانە، گوێرەکە، لە دەنگی ئەم وشانەی خوارەوە نزیك دەبنەوە: چیلۆ، چیسە، چیژ، چێرد، چول، چێش، چوێستان، چێو، چوێ ـ چیرە، چیسك، چێرە، چێژ، چوێ، چوێسوانە، چوێرەکە. ئەمەش مانای وانی یە کە ئەمانە دوو دەنگی جیاواز و تایبەتین لە زماندا. نەخێر. ئەمە تەنیا گۆڕانێکی ئاسایی یە و بە سەر ئەو دوو دەنگەدا دێ و لە و شوێنە تایبەتی یانەدا. جا لەبەر ئەوە پێویستی یان بەوە نی یە بە تیپی تایبەتی لە ئەلفوبێی کوردی دا دەست نیشان بکرێن.

## ١٣- دەنگی (ع) و (ح)

دەنگی ((ع)) و ((ح)) لە زمانی کوردی دا ئاسایی نین و خۆیی نین. بەڵام لەبەر ئەوەی ژمارەیەکی زۆر لە وشەی بێگانە بە کار دێنین، کە ئەم دوو دەنگەیان تێدایە، چارمان نی یە، دەبێ لە ئەلفوبێکەماندا وەریان بگرین، بەڵام کەم بە کاریان بێنین.

## ج ـ لە رووی لێکسیکۆلۆژی یەوە

مەبەست لە لێکسیکۆلۆژی Lexicology زانستی ناسینی ئەو ووشانەیە کە لە زمانەکەدا بەکاردەبرێن. ئەم زانستە جۆری دارشتنی ووشەکان و لێکدانەوەی بنەرەت وماناکانیان دەگرێتەوە.

جا ئەگەر ئێستە ئێمە لەم رووەوە تماشای هەردوو شێوەکە، بەتایبەتی و زمانی کوردی، بەگشتی، بکەین؛ دەبینین لە زمانی کوردی دا ژمارەیەکی یەکجار زۆر ووشە هەن، کە لە هەموو شێوەکاندا، بەتایبەتی لە کرمانجیی ژووروو و کرمانجیی نێوەراستدا، بەتەواوی، لەیەك دەچن. ئەو ووشانەی کە پێوەندییان بە مەڕوماڵات و کشتوکاڵ و ژیانی سەرەتایی یەوە هەیە، وەك بەرخ ـ گیسك ـ بەز ـ کەر ـ کورتان ـ کار ـ نێر ـ بەران ـ ئاش ـ کوڕ ـ کچ ـ دار ـ داس ـ گۆپاڵ ـ ماش ـ نیسك ـ نۆك ـ چەلتووك ـ زوو ـ درەنگ ـ کونجی ـ پیر ـ لاو ـ ژن ـ گەنم ـ رەش ـ سپی ـ ... هتد بە نزیکە (تقریبا) لە هەموو شێوەکاندا وەك یەکن. ئەمەش خۆی لە خۆی دا، بەڵگەیەکە کە شێوەکانی زمانی کوردی؛ هەموو لە بنچینەدا، دەچنەوە سەر یەك زمانی یەکگرتوو؛ کە ئەویش زمانی کوردی یە. چونکە ئەو ووشانەی کە گەلێك لە سەرەتای پەیدابوونی دا پێویستی پێ یانە؛ هەموو لە بابەتی ئەو ووشانەن کە لە سەرەوە نێومان بردن. هەروەها دەبێ بزانین کە هەر لەم شێوانەدا (بەتایبەتی ژووروو و نێوەراست)، ژمارەیەکی زۆر ووشە هەن، ئەگەرچی بەتەواوی لەیەك ناچن، بەلام پیاو بە سەرنجدانێکی سەرپێیی دەزانێ کە هاوڕەگەزی یەکن. ئەم ووشانە بە زۆری تییە دەنگدارەکانیان گۆڕاون بە یەکدی. بۆ وێنە: بارگیر ـ بەرگیر. جەواڵ ـ چوال ـ گاسن ـ گیسن. جووت ـ جۆت. خەرار ـ خرار ـ جۆ ـ جە. گوێ ـ گوە. هێندێکیشیان تییە بێ دەنگەکانیان گۆڕاوە یا کەوتووە. بۆ وێنە: قولنگ ـ کولنگ. ئارد ـ ئار. و ... هتد. هەروەها ژمارەیەکی زۆری دی ووشە هەن، کە هەرچەندە هاومانای یەکن، بەلام لە باری فەرهەنگی یەوە، لە یەکدی جیاوازن. بۆ وێنە: شووتی ـ زەبەش. هەڵامەت ـ پەسیڤ. لووت ـ بێڤل. نووستن ـ رازان. ووشە ـ پەرس. دەمرۆزە کردن ـ پارسکردن. شەرم ـ فەدی و ... هتد.

جا بۆ ئەوەی لە زمانە ئەدەبی یەکماندا؛ هەتا پێمان دەکرێ ووشەی کوردیی راست بەکاربهێنین، پێویستە ووشەکانی زمانەکە بە تەرازووی زانستی زمانەوانی بکێشین. بەتایبەتی ئەو ووشانەی کە جیاوازییەکانیان لە جیاوازیی تییە دەنگدارەکانیانەوە هاتووە؛ بە دەستووری لێکسیکۆلۆژیی کوردی، بپێوین وکامی راست بوو؛ ئەوەیان بەکاربهێنین. والێرەدا چەند نموونەیەك بۆ ئەم بابەتە پێشان دەدەم:

### وێنەی یەکەم: (ê) و (a)

لە کرمانجیی ژووروودا؛ ووشەی ((رێبەر)) هەیە بەرامبەر ووشەی ((رابەر)) و ((رەهبەر)) ی کرمانجیی نێوەراست و ژێروو. ئێستە بۆ ئەوەی یەکێك لەم ووشانە بکەینە کوردیی پەتی (ئەدەبی)؛ پێویستە ئەم سێ ووشەیە بەم جۆرەی خوارەوە شی بکەینەوە:

بە خوێندەوار کردنی کۆمەڵانی خەڵکی وولاتەکەمان،چەندە شتێکی بە سوودە، لە سەدەیەکدا کە هەموو کاروباری ژیان بە خێرایی دەچێ بە ڕێوە .

کە لە قوتابخانە ناوەندیەکانی کەرکووک و هەولێردا مامۆستا بووم، زۆرم هەوڵ دا نووسینی کوردی بە لاتینی بڵاو بکەمەوە وکەلێک لە قوتابی یەکانم و مامۆستاکانی هاوڕێم،فێری ئەو ئەلفوبێ یە کرد وکە لە ساڵی ١٩٥٧ دا نامیلکەی ((نووسینی کوردی بە لاتینی)) لەسەر بەر باسکرام، بڵاو کردەوە، بۆ ئەوە بوو کە ببێتە بنکەیەك بۆ گشتی کردنی (تعمیم) ئەم ئەلفوبێ یە . بەلام بە داخەوە ئەم هەوڵ و تەقەلایەی من،لە گەلێك لاوە کوێرکوێرانە درایە بەرلیسی هێرشی بێ جێ و تانووتی ناڕەوا،بە تایبەتی لە دوو لاوە:

لە لایەکەوە هێندێك لە موسوڵمانە تەنگ تیلکەکان دەیان گوت: ((ئەم لاتینی یە لادینی یە)) . لە لایەکی دیشەوە ڕۆژنامەی "اتحاد الشعب" کە ئەو دەمە زمانی حاڵی ((پارتی کۆمۆنیستی عێراقی)) بوو،لە ساڵی ١٩٥٩ دا ولە بەشی "صوت الشعب الکردی"دا، وتارێکی بۆ بەهائەدین شێخ نووری، بە نێوێکی خواستەمەنی یەوە بڵاو کردەوە ، کە لە وێدا بە خوتوخۆڕایی و شێوەیەکی کۆنە پەرستانە،هێرش برابووە سەر ئەوانەی خزمەتی ئەلفوبێی کوردی لاتینی دەکەن و ئەم کردەوەیەش بە کارێك درابووە قەڵەم کە دژی "یەکێتی نیشتمانی ی عێراق" بێ!!!

جارێ ئەوانەی کە بە ناوی ئاینەوە هێرش دەبەنە سەر ئەلفوبێی لاتینی، دەبێ بزانن،کە ئەم ئەلفوبێیەی –پێی دەڵێن ئەلفوبێی عەرەبی، لە بنەڕەتەوە لە ئەلفوبێی ئارامی یەوە وەرگیراوە، کە ئەلفوبێی گەلێکی دیان (مسیحی) بووە و ئەلفوبێی ئارامیش دەستە خوشکی ئەلفوبێی عیبری یە، کە ئەلفوبێی جوولەکانە (١٠١) . ئەمە ئەوە و هەروەها لە زەمانی پەیامبەری ئیسلامیشدا و هەتا ماوەیەکی زۆریش، نووسینی عەرەبی بێ سەر و بۆر و ژێر و زەنە و گیرە و هەڵکناوی و داکناوی نەبووە و دوایی بۆی دروستکراوە . پاشان ئەگەر پیاو بە بەکارهێنانی ئەلفوبێی لاتینی، بێ دین ببێ، دەبێ هەموو گەلی تورك بێ دین بن ، چونکە ئەمە پەنجا ساڵ پترە ئەلفوبێی لاتینی بەکاردێنن.

ئەمەش خاڵانەی ئەوەیە جارێکیان قوتابی یەك لە مزگەوت لە مامۆستاکەی دەپرسێ: ئەرێ مامۆستا ئەوە بۆچی هیچ کتێبێکی ئاینی بە کوردی نی یە؟ ئەویش بە لووتێکی بە ئەنقەست منگ کراوەوە دەڵێ: ((بابە لێ حەرامە هیچ مەرجەعێکی ئیسلامی، بە هیچ لیسانێك غەیری لوغەتی عەرەبی بیە، ببێ)) . قوتابی یەکە پێشی پێی دەڵێ: ((ئەی مامۆستا ئەوە قورئان خۆی بە فارسی و تورکی وەرگێڕاوە و گەلێك کتێبی ئاینیش هەر بە فارسی نووسراونەتەوە. ئەوە بۆچی ئەمانە حەرام نە بوون؟)) . مامۆستا دەشڵەژێ و دەڵێ: ((تاخیر ئەولا دەم، بە کوردی نابێ)) . کە قوتابی یەکە زۆر لەسەر قسەکە دەڕوا، مامۆستاکە پێی دەڵێ: ((با بە لێ: کوردی پا نیە،پان)).

ئەمجا با بێینە سەر ئەوانەی ئەم ((پانتێتی یەی)) زمانی کوردی لە قاڵبێکی دیدا،بەڵام بە هەمان ناوەڕۆك دەر دەبڕن . ئەوانەی کوا بێ ووردبوونەوە و زەحمەت دانە بەرخۆ و هەست بە بەرپرسیاری کردن بەرامبەر گەل و پاشەڕۆژی زمانەکەی، "پاراستنی یەکێتی ی نیشتمانی ی عێراق" لە بەربەرەکانێی ئەلفوبێیەکی تازەدا بۆ زمانی کوردی دەبینن و ئەوەش دەکەنە بەڵگە بۆ پەلاماردان و

وریاگرتن لە گەشە پێدان و پێشخستنی زمانی کوردی،لەسەر بنچینەیەکی زانستانە، ئەزبەش بەحاڵی خۆم، سەرەڕای هەموو ئەنجامێکی خراپی ئەم کارە، هێشتا وای دادەنێم کە ئەوانەی وا دەکەن، لە نەزانینەوە دەیکەن و نەك لە خراپی یەوە. بەلام ئەوانە دەبێ بزانن، کە زمانەوانی زانستە و تەنیا ئەوانەی پسپۆڕن دەتوانن لەم مەیدانەدا بیروڕای خۆیان دەربڕن، نەك ئەوانەی دوورن لە بابەتەکەوە. ئەمجا دەبێ ئەوەش بزانن، کاتێ چەند گەلێك لە وڵاتێکدا بوون و پێسترا بهێنرێنە سەر ئەوەی پێکەوە بژین و یەك بگرن، ئەوا دیارە ئەو پێکەوە ژیان و یەکگرتنە، تەنیا لەسەر بناخەی وەك یەکیی ئابووری و سیاسی و کۆمەلایەتی و خوێندەواری و ڕۆشنبیری پێك دێ، نەك لەسەر بنچینەی یەکێتیی درۆزنە و چاولێکەری دەسکرد و خۆ بەسەر یەکدا سەپاندن. دوایی بۆچی دەبێ چارەسەرکردنی گیروگرفتەکانی زمانی نەتەوەیەك بە شێوەیەکی زانستانە و ئەوپەڕی ئاشتیخوازانە، شتێکی خراپ بێ و دوژمنایەتی بێ بەرامبەر گەلێکی دی، لە کاتێکدا بە زۆر سەپاندنی ئەلفوبێ یەکی تایبەتی، کە بە کاری زمانی کوردی نەیەت، کارێکی "دیموکراتیانە" و "پێشکەوتنخوازانە" بێ و خزمەتی "یەکگرتن" و "برایەتی" بکات؟ . جا لەبەر ئەوەی لە ساڵی ١٩٦٠دا و لە ڕۆژنامەی ((صوت الاكراد))ی ئەودەمەدا، بە درێژیکەی پەنجا وتارێك بە زمانی عەرەبی، ئەم باسەم شی کردووەتەوە بە باشی، ئەوا پێویست نی یە پتر لەسەری بڕۆم. هیوام وایە ئەوانەی چواردە ساڵ لەمەوبەر لەسەر ئەو بیرە ناڕاستە بوون، ئێستە لەسەر ئەو بیرە نەمابن. بادانەوەش شوورەیی نی یە، بەڵکو جوامێری یە.

ئێستەش کە کورد لە عێراقدا، سەربەستی ی بە کوردی نووسینی هەیە، پێویستە هەموو داوودەزگەکانی، لەسەر دەستی زمانەوانەکاندا هەوڵی ئەوە بدەن ئەلفوبێ یەکی لاتینیی یەکگرتوو ئامادە بکەن و شان بەشانی ئەلفوبێی عەرەبی یە فارسی یە دەستکاریکراوەکەی ئێستە، لەسەر خۆ فێری قوتابی یەکان و خوێندکارەکان و هەموو کۆمەلەکانی گەلی بکەن. هەروەها نموونەیەکی ئەو ئەلفوبێ یە بە هەزاران دانە چاپ بکەن و بەسەر کوردەکانی دەرەوەی عێراقدا بلاوی بکەنەوە. ئەمەش ئەوە ناگەیەنێ کە ئیدی (ئیتر) دەبێ پشت بکەینە فێربوونی ئەلفوبێی عەرەبی و زمانی عەرەبی. نەخێر. بە پێچەوانەی ئەوەوە، ئەلفوبێ ی لاتینیی کوردی، وامان لێ دەکا کە ئەلفوبێ ی عەرەبی بە نیازی فێربوونی زمانی عەرەبی، باشتر فێر ببین. چونکە ئەوی ڕاستی بێ، نووسینی دوو زمان بە یەك ئەلفوبێ، سەر لە پیاو دەشێوێنێ. بۆ وێنە: منالێکی کورد ئەگەر فێری نووسینی ووشەی ((محـمـمد)) ببێ، دەبێ جارێ وای فێر بکرێ: ((محـمـد)) و جارێکی دیش وا: ((محمد مد)) ئەمەش کارێکی یەکجار گرانە. خۆ ئەگەر لە دەرزی کوردی دا ((محمد مد)) ی هەر بە ڕێنووسی عەرەبی فێر بکەین، (واتا، ئاوا: محـمـد) ئەوە مانای وایە زمانێکی فێر دەکەین بە دوو ڕێنووسی جیاواز.

جا لەبەر ئەوەی ئەلفوبێ ی لاتینی، ئەلفوبێی داهاتووە، پێویستە هەر لە ئێستەوە خۆمانی بۆ ئامادە بکەین، بەلام پلە پلە و لەسەر خۆ و دڵنیاش بین لەوەی کە ڕۆژی لە ڕۆژان دێ ئەو ئەلفوبێ یە جێی ئەوانی دی هەموویان دەگرێتەوە و ئەمەش فەرمانی زانستە و ئەوی دژی تەووژمی ڕامالکەری زانستی پێشکەوتنخوازبووستی، هەلدەخلیسکێ و لە ئەنجامدا پەشیمان دەبێتەوە.

# وێنەیەکی ئەلفوبێی لاتینیی دەستکاری کراو

والە خوارەوە وێنەیەکی ئەو ئەلفوبێ لاتینییە پێشان دەدەم کە ئێستە لە نێو خوێندەوارانی کورددا باوە ولە بنەڕەتەوە لە لایەن بەدرخانییەکانەوە چێ کراوە . ئەم لاتینییە وەنەبێ کە موکورتی و ناتەواوی نەبێ، بەڵام ئەوە هەیە لە هەموو جۆرەکانی دی باشترە . لەبەر ئەوە لە ساڵی (١٩٥٦) ەوە تا ئێستە خەریکی بڵاوکردنەوە و چاککردن و تەواوکردنیم . وێنەی ئەو چاککردنانە شوا هەر لێرەدا دەخەمە روو .

| تیپی لاتینی | | جۆری دەربڕینی | بەرامبەرەکەی | وێنەی بەکارهێنانی | |
|---|---|---|---|---|---|
| A | a | ئـا | (ئـا ا ـا) | ئـا ـ ئـا | a-a |
| B | b | بێ | (ب بـ ـبـ ـب) | با | ba |
| C | c | جێ | (ج جـ ـجـ ـج) | باج | bac |
| Ç | ç | چێ | (چ چـ ـچـ ـچ) | چا | ça |
| D | d | د ێ | (د ـد ـد ـد) | دادا | dada |
| E | e | ئە | (ئە ئە ـە ە ـە) | جاددە | cadde |
| Ê | ê | ئێ | (ئێ ئێـ ـێـ ـێ) | دەچێ | deçê |
| F | f | فێ | (ف فـ ـفـ ـف) | دەف | def |
| G | g | گێ | (گ گـ ـگـ ـگ) | جێگە | cêge |
| H | h | هێ | (ه هـ ـهـ ـه) | هەچە | heçe |
| Ȟ | ȟ | حێ | (ح حـ ـحـ ـح) | حەج | ȟec |
| I | i | ئـ | ـ نانووسرێ ـ | چ | çi |
| Î | î | ئی | (ئی ئیـ ـیـ ـی) | هیچ | hîç |
| J | j | ژ ێ | (ژ ژ ـژ ـژ) | دەژی | dejî |
| K | k | کێ | (ك کـ ـکـ ـك) | دەکا | deka |
| L | l | لێ | (ل لـ ـلـ ـل) | لاك | lak |
| Ľ | ľ | ڵێ | (ڵ ڵـ ـڵـ ـڵ) | دەڵێ | deľê |
| M | m | مێ | (م مـ ـمـ ـم) | ماچ | maç |
| N | n | نێ | (ن نـ ـنـ ـن) | نان | nan |
| O | o | ئۆ | (ۆ ۆ ـۆ ـۆ) | کۆکە | koke |
| Ö | ö | ئوێ | (وێ وێـ ـوێـ ـوێ) | نوێن | nön |
| P | p | پێ | (پ پـ ـپـ ـپ) | پاك | pak |
| Q | q | قێ | (ق قـ ـقـ ـق) | قەل | qel |
| R | r | ر ێ | (ر ر ـر ـر) | دەرد | derd |
| Ř | ř | ڕ ێ | (ڕ ڕ ـڕ ـڕ) | کەڕ | keř |

| تیپی لاتینی | | جۆری دەربڕینی | بەرامبەرەکەی | وێنەی بەکارهێنانی | |
|---|---|---|---|---|---|
| S | s | سێ | ( س سـ ـسـ ـس ) | سەر | ser |
| Ş | ş | شێ | ( ش شـ ـشـ ـش ) | شل | şil |
| T | t | تێ | ( ت تـ ـتـ ـت ) | ترش | tirş |
| U | u | ئو | ( ئو ئو ـو و ) | کورد | kurd |
| Û | û | ئوو | ( ئوو ئوو ـوو ـوو ) | چووم | çûm |
| V | v | ڤێ | ( ڤ ڤـ ـڤـ ـڤ ) | مرۆڤ | mirov |
| W | w | وێ | ( و و ـو ـو ) | وەرە | were |
| X | x | خێ | ( خ خـ ـخـ ـخ ) | بناخە | binaxe |
| Ẍ | ẍ | غێ | ( غ غـ ـغـ ـغ ) | بەغدا | beẍda |
| Y | y | یێ | ( ی یـ ـیـ ـی ) | یەك | yek |
| Z | z | زێ | ( ز ز ـز ـز ) | تەزرە | tezre |

سەرنج :ـ ئەو تیپانەی لە ژێر ستوونی (( بەرامبەرەکەی )) دا نووسراون ، وێنەی تیپە عەرەبی یە فارسی یە دەستکاری کراوەکان پیشان دەدا لە چوار باردا:

١ ــ لە بارێکدا کە سەربەخۆ و تەنیا دەربڕێن .

٢ ــ لە بارێکدا ببنە دەنگێك لە سەرەتای ووشەیەکدا.

٣ ــ لە بارێکدا ببنە دەنگێك لە نێوەڕاستی ووشەیەکدا .

٤ ــ لە بارێکدا ببنە دەنگێك لە کۆتایی ی ووشەیەکدا .

بۆ وێنە : دەنگی "ڤێ" ئەگەر بە تەنیا بێ ،وا دەنووسرێ : (ڤ ) ، ئەگەر لە سەرەتای ووشەدا بێ ،وا دەنووسرێ :( ڤـ ) ، ئەگەر لە نێوەڕاستی ووشەدا بێ ،وا دەنووسرێ: ( ـڤـ ) خۆ ئەگەر لە کۆتایی ی ووشەشدا بێ،وا دەنووسرێ :( ـڤ ).

تەواوکردنی ناتەواوی‌یەکانی ئەم ئەلفوبێ یە :

١ ) ــ لە سالی ( ١٩٥٧ ) دا و لە نامیلکەی (( نووسینی کوردی بە لاتینی )) دا ئەم شتانەی خوارەوەم خستە سەر ئەلفوبێکەی بەدرخان :

١ ــ دەنگی (ر) ی قەلەو و (ل ) ی قەلەوم بە (r̈ R̈) و (l̈ L̈) لە (ر ) ی سووك (r R) و (ل ) ی سووك (l L) جیاکردەوە . هۆی ئەمەش ئەوە بوو کە ئەو دوو دەنگە بە دوو تیپە ،لە لایەن چاپخانەی کوردستانەوە لە هەولێر بلاو کرابووەوە و ئەو چاپخانەیەش تەنیا چاپخانەیەك بوو کە تیپی لاتینی ی هەبوو . بەلام لام وایە؛ ئەگەر ئەو دوو تیپە وا ( r̂ و l̂ یا وا r̆ و l̆ بنووسرێن )،چێ ترە .

٢ ــ تیپی پێوەندی ی (حرف الجر )م پاش ووشەیەك کە بە تیپی دەنگدار کۆتایی هاتبێ ،لەگەل تیپی پێوەندی ی پاش ووشەیەك کە بە تیپی بێ دەنگ کۆتایی هاتبێ، لەیەك جیا کردەوە . بۆ یەکەمیان : ( y ) و بۆ دووەمیان :( î ) م دانا . بۆ وێنە : (( مامۆستای من mamostay min )) بەلام ((کوڕی من kurî min ))

٣ ــ تیپی بەستنەوەی (حرف العطف ) پاش ووشەیەك کە بە تیپی دەنگدار کۆتایی ی هاتبێ ، لەگەل تیپی بەستنەوەی پاش ووشەیەك کە بە تیپی بێ دەنگ کۆتایی هاتبێ ، لە یەك جیاکردەوە. بۆ یەکەمیان : ( w ) و بۆ دووەمیان :( û )م دانا . بۆ وێنە: (( مامۆستا و قوتابی mamosta w qutabî )) بەلام ((کوڕ و کچ kur̂ û kiç ))

چەند پێشنیازێکی دی :

١ ـ بە لای منەوە واباشە ئەم ئەلفوبێی لاتینی یەی کە ئێستە باوە بکەینە بنچینەیەك بۆ دانانی ئەلفوبێیەکی لاتینی سووکتر و هاسانتر .

٢ ـ هەتا دەتوانین دەبێ کارێکی وابکەین نوختە و چوکلە لە زمانەکەماندا کەمتر بکەینەوە . بۆوێنە : ( ئە e ) وابنووسین : ( ə ) و ( ئێ ê ) وا : ( e ) . ئەودەمە چوکلەی سەر ( ê ) دەتوانین فڕێ بدەین . هەروەها بۆ "بزرۆکە" لە جیاتی ( i ) وا بنووسین : ( ı ) ـ وەك تورکەکان دەینووسن ـ وئەوجا ( ئی î ) ش ئاوا بنووسین ( i ) . ئەودەمە لە چوکلەی سەر ( î ) ەکە رزگارمان دەبێ . لەوانەشە هی واهەبن کە لەم رووەوە پێشنیازی باشتر و بەجێتریان هەبێ .

٣ ـ ئەلفوبێ ، کە واوکراس نی یە ، پاش کۆن کردنی فڕێ بدرێ . لەبەر ئەوە نابێ لە دانانی ئەلفوبێی زمانەکەماندا بەهیچ جۆرێك پەلە بکەین . دەبێ بزانین کە چینی یەکان ئەمە ( ١٥ ) ساڵ پترە خەریکی ئەوەن زمانەکەیان بە ئەلفوبێی لاتینی بنووسن وهێشتا هەر خەریکی پڕاوەن . ئێمە لە گەلی چینی تێکۆشەر زاناتر و پێشکەوتووتر نین .

## نموونەیەك لە نووسینی کوردی یەکگرتوو

لە کۆتایی ئەم بەندەشدا دەمەوێ ئێستە پارچەیەك نووسینی کوردی ، بەو شێوەیەی کە لەم نامیلکەیەدا باسم کردووە ، پێشکەش بە خوێندەوارانی کورد بکەم . مەبەستم لەمە ئەوە نی یە بیروڕای خۆم بە سەر کەسدا بسەپێنم . زمان مڵکی گەلە و کاری منیش تەنیا ئەوە یە چی بە باش دەزانم ، وەك پێشنیاز بیخەمە بەردەمی گەل . لە گەڵ ئەوەشدا دڵنیام ، ئەوی بە چاوێکی دووربینانەی زانایانەوە تەماشای ئەم تێکستە بکا ، دەبینێ زمانی نووسینی کوردی لەم رێیەوە زۆر هاسان دەبێ و زمانەکە لە رووی مۆرفۆلۆژی و فۆنۆلۆژی و لێکسیکۆلۆژی و ئۆرتۆگرافی یەوە یەك دەگرێ و زۆربەی زۆری رێزمان و وشەکانی ، بۆ هەموو کوردێك ، سووك دەبێ و ئیدی کەسیش گلە یی ی ئەوەی نامێنێ کە ئەم کوردی یە (( زاراوای سلەیمانی یە )) .

والێرەدا تێکستەکە بە تیپی عەرەبی ـ فارسی ی دەستکاری کراو و بە تیپی لاتینی دەنووسم .

هەگە ( ئەگەر ) زمانی کوردی بە تیپی لاتینی بنووسرێ ( بێتە نووسین ) چێترە ( چاترە ) . جا هەرچەندە ئەم کارە کارێکی نە هاسانە و دژوارە ، بەلام ئێمە دەبێ بۆ گەیشتن بەم ئامانجە پڕ ( زۆر ) بخەبتێن ( خەباتبکەین ) . ئێمە دەزانین کە لە هەموو کوردستانی مەزندا ، تەنێ ( تەنیا ) لە کوردستانی عێراق و سۆڤێتدا ، زمانی کوردی ئازادە و تەنێ لە و دوو جێ یە خوێندنگەی کوردی هەن و رۆژنامە و کتێب و گۆڤار بە کوردی چێ دەبن ( دروستدەبن ) و لە چاپ دەدرێن . لە پارچەکانی دی کوردستاندا ، وەك تورکیا و ئێران و سووریا ، ئەگەرچی کورد بە ژمارە

لە و دوو جۆیەی نێویان برا ( ناڤێ وانئانی ) پترن، بەلام خوێندن بە زمانی کوردی رێی پێ نادرێ ، بۆیە دەبێ بەر لە هەر تشتێک، تێ بکۆشین کە تیپەکانی نووسینی کوردی بکەینە یەک و ئەلفوبێ یەکی یەکگرتوو بۆ زمانی خۆمان چێ بکەین ، تا کوردی هەموو پارچەکانی کوردستان بکارن ( بتوانن ) نووسینی یەکدی ( یەکتر ) بخوێننەوە .

ئەز ناخوازم (نامەوێ) لە خۆمەوە پێشبینی بکەم، چونکە نازانم پاشەڕۆژی زمانی کوردی و سنووری بلاڤبوونەوەی وی ( ئەو ) چۆن دەبێ ، بەلام دەکارم لە ئەمڕۆوە بێژم؛ هەگە رۆشنبیرانی کورد تەڤی یەک ( لەگەڵ یەک ) ئالیکاری ( هەرەوەزی ) بکەن و بە هەستی خاوێن و زێلا ( دڵ ) ی پاکەوە کاربکەن؛ رۆژێک دێ؛ گەلی کورد، مینا ( وەک ) گەلانی دی جیهان، دەبێتە خاوەنی زمانی یەکگرتووی خۆی .

کورد دەبێژن (( مرۆڤ نەگایە؛ هەتا مردن لە نێو یەک پێستدا بژیێ )) . ئەمە پەندێکی پڕ بە جێیە . پیاوی هۆشیار و ژیرەک و تێگەیشتوو و دڵسۆز؛ دەبێ باوەڕی بە گۆڕینی باری ژین ببێ و هیچ کاتێک هەل ( فرسەت ) لە دەستنەدا و بیری بخاتە کار و شەڤ و رۆژ بۆ پێشخستنی کۆمەڵگەی خۆی و رووناککردنەوەی بیری کۆمەلانی گەلەکەی تێ بکۆشێ . جۆتکار و کرێکار بەردی بناخەی کۆمەڵگە و هەڤێنی ( هەوێنی ) بزووتنەوەی نەتەوەن . ئەوانە دەبێ لە لایەن رۆشنبیرانەوە قسە بکرێ بۆیان و بەر لە هەر تشتێک فێری خوێندن و نووسین بکرێن و بخرێنە سەر رێی راست، تاکو بکارن دەوری خۆیان لە کۆمەڵگەدا ببینن .

سەرنج : ئەو ووشانەی ناوکۆیی ( مشاع )نەبوون بۆ هەردوو شێوەکە، لە کەواندا مانایم لێکدایەوە .

Hege(eger) zimanî kurdî be tîpî latînî binûsrê(bête nûsîn) çêtire(çatire). Ca herçende em kare karêkî ne hasane w dijware, belam ême debê bo geyiştin bem amance pir̂(zor) bixebtîn(xebat bikeyin). Ême dezanîn ke le hemû kurdistanî mezinda,tenê( tenya) le kurdistanî 'Êraq û Sovêtda,zimanî kurdî azade w tenê lew dû cêye xöndingey kurdî hen û rojname w govar û kitêb be kurdî çêdebin(durust debin) û leçapdedirên. Le parçekanî dî kurdistanda; wek Turkiya w Êran û Sûriya;egerçî kurd be jimare lew dû cêyey nêwyan bira(navê wan anî) pitirin,belam xöndin be zimanî kurdî rêypênadirê,boye debê ber le her tiştêk,têbikoşîn ke tîpekanî nûsînî kurdî bikeyneyek û elfûbêyekî yekgirtû bo zimanî xoman çêbikeyin,ta kurdî hemû parçekanî kurdistan bikarin(bituwanin) nûsînî yekdî (yektir) bixönnewe.

Ez naxuwazim (namewê) lexomewe pêşbînî bikem,çunke nazanim paşer̂ojî zimanî kurdî w sinûrî bilavbûnewey wî (ew) çon debê, belam dekarim le emr̂owe bêjim;hege roşinbîranî kurd tevî yek (legel yek) alîkarî (herewezî) biken û be hestî xawên û zêlî (dil) pakewe karbiken;rojêk dê;gelî kurd,mîna (wek) gelanî dî cîhan,debête xawenî zimanî yekgirtûy xoy.

Kurd debêjin ((Mirov ne gaye;heta mirdin le nêw yek pêst da bijê)). Eme pendêkî pir̂ becêye. Piyawî hoşyar û jîrek û têgeyiştû w dilsoj;debê bawer̂î be gor̂înî barî jîn bibê w hîç katêk hel (firset) ledestneda w bîrî bixatekar û şev û roj bo pêşxistinî komelgey xoy û rûnakkirdinewey bîrî komelanî gelekey têbikoşê. Cotkar û kirêkar berdî binaxey komelge w hevên(hewên) î bizûtinewey netewen. Ewane debê le layen roşinbîranewe qise bikrê boyan û ber le her tiştêk fêrî xöndin û nûsîn bikrên û bixrêne ser rêy rast,taku bikarin dewrî xoyan le komelgeda bibînin.

# دووا ووشە

## خوێنەرەوەی بەڕێز

وا ئێستە تۆلە خوێندنەوەی ئەم نامیلکەیە بوویتەوە و بێگومان ئەگەر باش سەرنجی ناوەرۆکەکەیت دابێ و جوان تێی گەیشتبیت، دەبێ هەستت بەوە کردبێ کە ئەم چەند لاپەڕەیە، نەک تەنیا هەوڵدانێکی پێشڕەوانەیە لە پێناوی ڕێخۆشکردندا بۆ هێنانەدی زمانێکی یەکگرتووی ئەدەبی بۆ گەلەکەت و بەس، بەڵکو هەر لەو کاتەشدا و بۆ یەکەمین جار، ئەو ڕاستی یە دەخاتە ڕوو، کە زمانی کوردی، ئەگەر بێتو بە تەرازووی زمانەوانی بکێشرێ، زمانێکی سەربەخۆی زیندووە و شێوە و زاراوای هیچ زمانێکی دی نی یە. بە کورتی: زمانێکە، وەک هەموو زمانێکی سەربەخۆی دی، دەستووری مۆرفۆلۆژی و فۆنۆلۆژی و لێکسیکۆلۆژی تایبەتی ی خۆی هەیە.

بەڵام وەنەبێ ـ وەک لەمەو بەر گوتم ـ نیازی ئەم نووسراوە، بەرینی کاڵای پڕ بە باڵای زمانی کوردیی پاشەڕۆژمان بێ. چونکە زمانی یەکگرتووی ئەدەبی، نە بە ڕۆژ و دوو ڕۆژ و نە بەکاری یەک و دوو دێتە بەرهەم. بەڵکو بەماوەیەکی یەکجار زۆر و تێکۆشانێکی گشتلایی ی درێژخایەن دێتەکایەوە. هەر لەبەر ئەوەش بوو کە لە نووسینەوەی ئەم نامیلکەیەدا، تەنیا تا ئەندازەیەکی تایبەتی پەیڕەوی ی پێشنیازەکانی خۆم کرد و بەسەندکردنی زۆربەی زۆری لێکۆڵینەوەکانم هێشتەوە بۆ بڕیاری ڕۆشنبیرانی پێشکەوتنخوازی خەباتکاری گەلەکەمان.

ئەوەی لێرەدا زۆر بە پێویستی بزانم، ئەوەیە بڵێم کە فەرمانی سەرشانی هەموو ڕۆشنبیرێکی کورد لەم مەیدانەدا ئەوەیە، بەرەو ئەم ئامانجە تێ بکۆشێ. بەتایبەتی ئەوانەی کتێب بۆ قوتابخانەکان دەنووسنەوە و ئەوانەی لە ڕادیۆ و تەلەفزیۆندا قسە دەکەن و ئەوانەی ڕۆژنامە و گۆڤار دەردەکەن و ئەوانەی کتێب و نامیلکە دەنووسنەوە، ئەرکێکی زۆر گەورەیان لە ئەستۆدایە. ئەوانە دەبێ ئاگا بن لەوە بێ کە ئەو شێوەیەی بۆ زمانی کوردی، بە درێژایی ی مێژووی زمانەکە خۆی، دروست بووە و پێکهاتووە، لەلایەن نەزان و ناشییەوە خراپ نەکرێ و تێک نەدرێ. و بەرەبەرە ئەو لایەنە باشانەی لە شێوەی کرمانجی ی ژووروو و شێوە لاتەنیشتەکاندا هەن، بخرێنە نێوی، بۆ ئەوەی بە یارمەتی ی هەموو زاراواکانی زمانەکە، شێوەیەکی ئەدەبی ی یەکگرتوو پەیدا ببێ. بۆ وێنە: نابێ یەکێک هەستێ و لە گۆڤارێک یا جێی یەکی دیدا، بە ((ئەدی کوو بابم)) و ((ئەوە لۆچی ئەنگۆ گەمەی دەکەن.)) و ((گۆشت خاس لە وازار فرە هەس)) و ((بیم وەتوروان ریش چەرمووگت.)) شت بنووسێ. هەموو دەستکاری یەکی زمانە ئەدەبی یەکەمان، دەبێ پاش وورد بوونەوە و لێکۆڵینەوە بکرێ و ئەوجا هەموولایەک وەک یەک پەیڕەوی بکەن. هەروەها کتێبی قوتابخانەکان پێویستە وەکو ئێستە نەبن کە هەریەکەیان لە ئاوازێکی دی دەخوێنێ. واتا نابێ یەکێک بچێ و بنووسێ ((دەچن)) و ئەوی دی بنووسێ ((ئەچن)) و یەکێکی دی بنووسێ ((دچن)). دەبێ هەموویان یەک جۆر بنووسن. دوایی دەمەوێ ئەوە بڵێم، نووسینی دێڕێک بە زاراوای سلێمانی و دێڕێک بە هەولێریانی و دێڕێک بە بادینانی و دوو ووشە بە موکریانی و ووشەیەک بە سنەیی یانی، زمانی کوردی ناکاتە یەک. هەروەها قسەپێکەرانی زاراوایەکی تایبەتی فێری زاراواکانی دی ناکا، بەڵکو سەر

(١٠٢) لە هەموویان تێك دەدا و زمانی کوردیش بەرەو لە نێوچوون و نەمان دەبا. ئەمجا ئەو زاراوە یانە (مصطلحات) ی بەکاردەبرێن، دەبێ هەموو وەك یەك بن و لە دانانی زاراوەدا، دەبێ هەردوو شێوە گەورەکە و هەموو زاراواکانی زمانی کوردی بخرێنە بەرچاو. واتا نابێ یەکێك بە ((ضمیر)) بڵێ "جێ نا و" و یەکێك "رانا و" و یەکێکی دی "بەرۆنێو" و ئەوی دی "بەرناڤ" و ئەمانە هەمووی بەسەر قوتابی یەکی منداڵی بەسزماندا بسەپێنرێ. زاراوەکان دەبێ زمانەوانان دروستیان بکەن و لە هەموو کتێبەکاندا بە یەك جۆر بنووسرێن و بەکاربهێنرێن.

هەرچەندە رێنووسی عەرەبی - فارسی دەستکاری کراو، وەك لەمەو پێش باسمان کرد، تاسەر بەکاری زمانی کوردی نایەت، بەلام چارمان ناچارە، جارێ دەبێ بە پێی دەسەڵات، دەستوورێکی رێکوپێکی بۆ دابنێین و هەموو شتێك هەر بەو پێ یە بنووسینەوە. جا لەبەر ئەوەی تا ئێستە لەم بارەوە هیچ بڕیارێکی بنچ بڕ نەدراوە، لە نووسینەوەی ئەم نامیلکەیەدا؛ نەمتوانی خۆم بە رێنووسێکی تایبەتی یەوە ببەستم. بەلام ئەگەر هاتوو دەستوورێکی باش دانرا؛ چ بۆ نووسین وچ بۆ زاراوە داهێنان و چ بۆ رێزمان فراوان کردن وچ بۆ ووشە وەرگرتن و فڕێ دان، لە لایەن شارەزایان و زمانەوانانەوە؛ ئەوا ئەوجا کەس مافی ئەوەی نامێنێ پێڕەوی نەکا. خۆ ئەگەر نەی کرد، ئەوا دیارە ئەوکەسە خۆویست و خۆپێشاندەرە و مەبەستی تەنیا خراپەکاری یە. پاشان کتێبەکانی قوتابخانەکان و نووسینەکانمان، پێویستە زانستانە بن. ئەوانەی دەنووسن؛ دەبێ زانا و لێ هاتوو بن. ئەوجا هەموو کتێبەکانی قوتابخانەکان دەبێ لە لایەن یەك لیژنەی تایبەتی یەوە کە پسپۆڕی هەموو بەشێکی زانستی تێدا بێ؛ ووشە بە ووشە و سەرلەنوێ بخوێنرێنەوە و بژار بکرێن، تا وایان لێ دەکرێ وەکو تەنیا کەسێك هەمووی نووسیبێتەوە وادەبن. واتا دەبێ هەموو یەك جۆر بن؛ چ لە باری زاراوە وچ لە باری رێزمان وچ لە باری رێنووسەوە.

ئەگەرچی ئێرە جێی ئەوە نی یە هەموو ئەو شتانەی بڵاو دەکرێنەوە، بیانخەمە ژێر وورد بینی لێکۆڵینەوەوە، چونکە نە ئەو کاتە زۆرەم هەیە و نە هەموو ئەو شتانەی دەردەچن دەگەنە دەستم، لەگەڵ ئەوەشدا پێویستە ئەوە بڵێم کە هەندێ قسەی یەکجار قۆڕ و نەزانانە دەنووسرێن، بە تایبەتی لە کتێبی قوتابخانەکاندا؛ وەك ئەوەی گوایە ((ئاڤێستا)) یەکەمین کتێبێکە کە بە زمانی کوردی نووسرابێتەوە و ئەردەشێری پاپەکان؛ کە گوایە "پاشایەکی کورد "بووە، فەرمانی داوە بە کۆکردنەوەی ((ئاڤێستا))، پاش لە نێو چوونی. هەرچەندە ئەم نامیلکەیە بۆ ئەوە تەرخان نەکراوە کە باسی ئایینی زەردەشتێتی و ئاڤێستای تێدا بکرێ، بەلام لێرەدا ناچارم ئەوە بڵێم - وەك لە جێ یەکی دیشدا هەر گوتوومە - کتێبی ((ئاڤێستا)) چەند سەدەیەك پاش مردنی زەردەشت خۆی نووسراوەتەوە و دوواپی لەلایەن کەسانێکەوە کۆکراوەتەوە کە هەموویان خەڵکی ناوچەی مادەکان نەبوون. هەرچەندە گوایە ((گاتاکان)) بە شێکیان سروودی زەردەشت خۆین؛ بەلام بۆ ئەوەش هیچ بەڵگەیەکی بنچ بڕ (قاطع) بەدەستەوە نی یە. جا هەرچەندە ئەو زمانەی کە ((ئاڤێستا)) ی پێ نووسراوەتەوە فارسی نی یە و زمانێکی تایبەتی یە و بە زمانی ئاڤێستا ناوی رۆیوە، ئەمجا لەگەڵ ئەوەشدا کە بەشێك لە زمانی ئاڤێستا لە هەندێ رووەوە، بە تایبەتی لە باری لێکسیکۆلۆژی یەوە، لە کوردی ی ئەمڕۆ دەچێ، بەلام دیسانەوە ئەمە بەڵگە نی یە بۆ ئەوەی کە ئاڤێستا هەمووی کوردی ی کۆنە. بە بیروڕای من، زەردەشت جۆتکارێکی خەڵکی ناوچەی

ماد بووە (١٠٣) وهەر لە نێو خەڵکی وڵاتەکەی خۆیدا بیروباوەڕەکەی خۆی بڵاوکردووەتەوە. بەڵام پاش ئەوەی لە لایەن مادە کۆچەرەکانەوە (بەشێکی زۆری کوردی ئەو دەمە) بەربەرەکانێ کراوە و لە وڵات دەرپەڕێنراوە، چووە بۆ ناوچەکانی دی ئێران و ئاینەکەی لەوێدا بڵاوکردووەتەوە و پاشەجار ئەشکانی یەکان (١٥٠ – ٢٢٤ ز) قسەکانیان کۆکردووەتەوە. دووای ئەوانیش ساسانی یەکان (٢٢٤ – ٦٥٢) جارێکی دی کۆیان کردووەتەوە. دیارە ئەشکانی یەکانیش و ساسانی یەکانیش، هەریەکەیان تا رادەیەکی زۆر شێوەی زمانی ئەو کاتەی خۆیان، بەسەر زمانی بنەڕەتیی ئاڤێستادا بڕیوە و تێکەڵیان کردووە، بەڵام وادیارە لەبەر ئەوەی کە ئاینی زەردەشت بە زمانی مادەکان بووە نەیانتوانیوە زمانی مادەکان بەجارێ لە ئاڤێستا لابەرن و زمانەکانی خۆیان لەجێی ئەوە دابنێن. بۆیە ناچار بوون، هێندێ لەو زمانەی کە زەردەشت ئاینەکەی پێ بڵاوکردووەتەوە، تێکەڵ بە زمانەکانی خۆیان بکەن. بەکورتی لەوە زمانێکی مادی – ئەشکانی – ساسانیی تێکەڵ پەیدابووە و وردە وردە زمانەکانی دی ئێرانی تێکەڵ بووە و بووەتە ئەو زمانەی کە پێی دەڵێن ((ئاڤێستا)).

ئەمجا ئەردەشێری پاپەکانیش (٢٢٤ – ٢٤١) "پاشایەکی کورد" نەبووە. بەپێی کتێبی ((کارنامەکی ئەرتەخشێری پاپەکان)) – واتا "کارنامەی ئەردەشێری پاپەکان" کە کتێبێکە بە زمانی پەهلەوی – واتا فارسیی نێوەڕاست – نووسراوەتەوە؛ ئەردەشێر لە ترسی کوشتن رای کردووەتە لای شوانە کوردەکان و لە نێو ئەواندا ژیاوە. ئەوانیش دالدەیان داوە و لە نێویاندا ماوەتەوە، تا هەلی بۆ هەڵکەوتووە و پاشای کوردەکانی مادی کوشتووە. ئەم کتێبە پاشای کوردە مادەکان بە "کورتان شا ماد یك" نێودەبا (١٠٤). هەروەها بەپێی "شانامەی فیردەوسی" (١٠٥) ئەردەشێری پاپەکان بە فێڵ لەشکری کوردی خەڵەتاندووە و کە خەویان لێ کەوتووە، ئەوجا پەلاماری داون و سەربازەکانی لە خەودا سەربڕیوە و بەوە سوپای کوردەکانی شکاندووە و دەوڵەتی ئەشکانیی دامەزراندووە. ئەمجا ئێستە ئەم سنگ شێری ماکەرپشتە، کوێ کورد بووە و ئەم هەواڵە درۆ و دەستکردە لە کوێ و لە چ سەرچاوەیەکەوە وەرگیراوە؟

راستی یەکەی بەشێکی گەورەی ئۆبالی ئەم درۆ دەلەسانە و لە پاڵ ئەوەشدا تێکدانی مێژووی کورد بە دڵی دوژمنان، ئەوەیە بە زۆری ئەوانەی قەڵەمیان بەدەستەوە بووە تا ئێستە لە کوردستاندا، یا سەر بە رژێمی دەرەبەگیتی و هۆزایەتی بوون، یا سەر بە بیروباوەڕ و جۆری بیرکردنەوەی وردە بۆرجوازی بوون. ئەم دوو چینە – کە دەڵێم چین، مەبەستم لەو پەیوەندی یە کۆمەڵایەتی یەیە کە خاوەنی دەسکەوت و بەرژەوەندی و بیروڕایەکی تایبەتی یە، جیا لە هی چینەکانی دی گەل و مەبەستم لە تاکە تاکەی هیچ چینێک نی یە – دەڵێم ئەم دوو چینە، بە تایبەتی چینی وردە بۆرجوازیی کورد، کە دەسکەلای دەستی بۆرجوازیتیی گەورەی ئەو وڵاتانەیە کە کوردستانیان بەش کردووە، چونکە کورد خۆی بۆرجوازیتیی گەورەی – وەك چین – نی یە؛ ئەمانە باوەڕیان بە گەل نی یە. لەبەر ئەوە مێژوو بە مێژووی ئەم "خان" و ئەو "شێخ" و ئەو "شا" دەزانن و بۆ ئەمەش پێویستیان بەوەیە، خۆیان بە هێندێ سەرکردەوە بابدەن و هێندێکیش بۆ خۆیان بە خەیاڵ دابتاشن و جاری واش هەیە، ناچار دەبن، هی وەك ئەردەشێری پاپەکانیش بە "شای خۆیان" بدەنە قەڵەم. با ئەردەشێریش کورد نەبووبێ، یا دوژمنی هەرە خوێنینی کورد بوو بێ، ئەوە قەی ناکا.

بەکورتی: ئەم کردەوانە با هێندێکیشیان بە نیازی پیس نەکرابن، بەڵام ئەنجامەکەی

له ژیان بەو لاوه هیچی دی نی یه . ئەوانەی ئەم شتانەش دەنووسن و بلاو دەکەنەوه، دەبێ بزانن، کارەکە یان لە فشە کوردایەتی یەکی کونەپەرستانەی تەنگەبەرانە بترازێ، هیچی دی نی یه . مێژووی کورد تا ئێستە نەنووسراوەتەوه . جا دڵ نیام ئێستە زۆر کەس لەمە دادە چڵەکێن و دەڵێن : (( چۆن مێژووی کورد نەنووسراوەتەوه ؟ ئەی " شەرەفنامە " چی یه ؟ ئەی کتێبەکەی ئەمین زەکی چی یه ؟ ئەی " مێژووی مەردۆخ " یا کتێبەکەی " ئیحسان نووری چی یه ) ؟ )) .

لە وەرامدا دەڵێم، ئەمانە هەمووی دەنگوباسن و هەواڵ و بەسەرهاتی ژیانی هێندێ لە سەرداران و نێودارانی کوردن کە بەشێکیشیان، هیچ دەورێکیان لە کۆمەڵگەی ( مجتمع ) کورددا نەگێڕاوه . مێژوو بە لای منەوه، مێژووی گەلە و مێژووی هەموو گەلێکیش پێویستە لە چاویلکەی ئەو بیروباوەڕ و بزووتنەوانەوه تەماشا بکرێ کە لە نێوجەرگەی گەلەکە خۆیەوه هەڵقوڵیون و ویستوویانە بەرژەوەندیی مادی و گیانیی ئەو گەلە بپارێزن و بنبەستی بکەن و گەلەکە وەك گەل بهێڵنەوه . مێژووی نەتەوەی کورد، مێژووی کۆمەڵگەی شوان و جوتکار و رۆشنبیری کوردە – مێژووی هەموو داوودەزگە نهێنی و ئاشکراکانێتی، کە هەریەکەیان لە پاڵ رێگە و بیروباوەڕێکدا – خۆیی یا ناخۆیی – خۆی نواندووه و ویستوویەتی کاریکاتە سەر کۆمەڵگە و کۆمەڵگەش کاری تێ کردووه . مێژووی کورد، سەرەنجامی لەیەکدان ( تضارب ) و یەکگرتنی ( اتحاد ) ی ئەم هێزانە یه، لەباری سەرنجی ئەو بەرژەوەندی یەوه کە باسکرا . ئەم مێژووە، تا ئێستە نەنووسراوەتەوه . مێژووی ژیان و بەسەرهاتی خوالێ خۆشبووان، سەلاحەدینی ئەیووبی و کەریم خانی زەند، مێژووی نەتەوەی کورد نین . ئەمانە هەزار رەحمەت لە گۆڕیان – هەرچەندە لە خێزانێکی کورد بوون – هیچ دەورێکیان لە کارکردنە سەر پێشخستن و گۆڕینی کۆمەڵگەی کورددا، نە بووه . خەبات و بەسەرهاتیان بەشێك نی یە لە مێژووی کۆمەڵگەی کورد .

بەڵێ . مێژوو مێژووی گەلە – وەك لە سەرەوه باسمان کرد . هەر گەلیشە کە مێژوو دروست دەکا و هۆی ئەو دروستکردنەشی بۆ ئامادە دەکا . هەوێنی دروستکردنەکەش بیروباوەڕە و قالبەکەشی کۆمەڵگە یه و شێوەی دەربڕینیشی بزووتنەوه یه . سنووری هەموو بزووتنەوه یەکیش بە قەڵەمی هەڵگرانی بیروباوەڕی خاوەن بزووتنەوه دەکێشرێ و بە زۆری دەستی هاوبیرانی لە خۆبوردووانی بیروباوەڕەکە دەپارێزرێ . هەرکاتێکیش مێشك و دەست کەوتنە یەك – واتا – دەستی خاوەن باوەڕ، بە قسەی مێشکی خاوەن باوەڕی کرد، ئەوا مێژوو دروست دەبێ . لێرەدا بە هەموو دڵنیایی یەکەوه دەڵێم، باسێکی بابەتانە و شی کردنەوه یەکی زانستانەی بینایانە ( واعی )ی کۆمەڵگەی کورد، هەر لە کۆنەوه تا ئێستە، لە چەند لاپەڕەیەکی تاکە کتێبێکدا نە بێ، لە هیچ جێ یەکی دی دا، تەنانەت بە سەرپێ ییش، نە کراوه .

ئەوجا ئێستە ناهەقمە ئەگەر جارێکی دیش بڵێم : " مێژووی کورد تا ئێستە نە نووسراوەتەوه " ... بەڵێ ؛ " دەبێ مێژووی کورد بنووسینەوه " و مێژووش بۆ کورد دروست بکەین .

# کۆتایی هات

# پەراوێزەکان

( * ) _ ئەم سەرەتایەم لە مانگی شوباتی ساڵی ( ١٩٧٤ ) دا نووسیووە؛ واتا کاتێک کە لە نووسینەوەی نامیلکەکە بوومەتەوە. ئەوەی ڕاستی بێ؛ هەر چەند ڕۆژێک دووای تەواوکردنی، لەسەر داخوازیی کۆنە ئاشنایەکم کە دوکتۆری زمانی کوردی یە و ئەو دەمە سەرۆکی دەزگایەکی گەورەی ڕۆشنبیریی پانەش بوو لە بەغدا، ناردمە ئەوێ تا لە چاپی بدا و بڵاوی بکاتەوە. هۆی ناردنەکەشی، لەبنەڕەتەوە ئەوە بوو کە چاپکردنی ئەم نامیلکەیەم لە ئەورووپا بە ڕاست نەزانی. چونکە جارێ نامیلکەکە بە کوردی نووسراوە و بۆ کورد نووسراوە، لەبەر ئەوە دەبوو هەر لە عێراق چاپ بکرێ و هەر لەوێش بڵاو بکرێتەوە. دووایی چاپکردنی ئەم جۆرە شتانە لێرە، بە ئەرکێکی فرە زۆر و پارەیەکی یەکجار مۆڵ تەواو دەبێ کە لە ووزەی من و (( یەکیتیی نەتەوەیی خوێندکارانی کورد لە ئەورووپا )) بە دەرە. هەرچی چونێک بوو ئەو ئاشنایە ـ بێ چاوێنی بێ ـ نە کتێبەکەی چاپ کرد بۆم و نە دەستنووسەکەی ناردەوە بۆم و نە وەرامی چوار پێنج نامەی تۆمارکراو ( مسجل ) ی یەک لە دووای یەکی دامەوە. کە خێرومەندێکیش ڕۆژێکیان چووبووە لای و داوای دەستنووسەکەی لێ کردبوو تا سەرپەرشتیی چاپەکەی بکات، نەی داوبوو یە. جا پاش ئەوەی ئەم ماوە دوور و درێژەی بەسەردا تێپەڕ بوو، نامیلکەکەش خەریک بوو هەر بە جارێ گۆڕی وون ببێ، بڕیارم دا بە هەر زەحمەت و بەختکاری یەک دەبێ، سەرەڕای هەموو پڕ کاری و دەست نەبەرژاوی یەکیش، نامیلکەکە لێرە چاپ بکەم. لەبەر ئەوە ناچار بووم جارێکی دی سەر لە نوێ پارچە کاغەزە شڕەکان بەیەکەوە بنێمەوە و نامیلکەکە بە دەستی خۆم بۆ چاپخانەی ئۆفسێت بنووسمەوە. جا لەبەر ئەوەی تایپرایتەری کوردی و کوردیی لاتینی دەست ناکەون، هاتم بە تایپرایتەری فارسی و ئەڵمانی تایپم کرد و تەواوی چوکلە و نیشانەکانم بە دەستی خۆم بۆ تەواو کرد. ڕێکخستنەوە و نووسینەوە و ئامادەکردنی نامیلکەکە بۆ چاپ ( ٦٤٨ ) سەعات کاتی تێ چوو؛ کە بێگومان ئەم کاتە لەو چەند سەعاتەکەمەی شەوم دزیوە کە دەشیا تێیدا بحەوێمەوە، پاش زەحمەت و کار و شەکەتیی ی ڕۆژ، یا بە کارم بهێنایە بۆ خزمەتێکی باشتر لە نووسینەوە و تایپ کردن کە ئەوەندە هونەر نوواندن و وەستایی یان پێویست نی یە.

ئەوەی شایانی باسە ئەوەیە؛ ئەمجارە هێندێ شتی نوێم خستە سەر دەستنووسە کۆنەکە؛ بە تایبەتی چونکە هێندێ لاپەڕەی فەوتا بوو و دەبوو سەر لە نوێ بیان نووسمەوە، بەڵام لەبەر گرانیی بێ ئەندازەی ئەرکی چاپخانە، نەمانتوانی لە ( ٦٠٠ ) دانەی پتر لێ چاپ بکەین.

ئێستەش خۆم زۆر بە بەختیار دەزانم کە توانیم ئەم بەرهەمە ـ کە بە داخەوە دوو ساڵ پاش تەواوکردنی دەچێتە ژێر چاپ ـ سەرەڕای هەموو بەرهەڵست و دەرۆ لە گەڵ کردن و تەفرەدان و دەستی پێ کردنێک، بەم شێوە جوانە ڕازاوەیە پێشکەش بە ڕۆشنبیرانی تێکۆشەری گەلەکەم بکەم و دڵنیاشم لەوەی؛ ئەگەر پیا و بێ ووچان و بێ شوودان، بەرەو ئامانجی خۆی هەنگاو بنێ و دانیشی بە خۆی دا بگرێ و پشتی سارد نەبێتەوە، ئەوا کاتێک دێ؛ تەمی شەوەزەنگ دەڕەوێتەوە و دیسانەوە ڕۆژ هەڵ دێتەوە و ئەوجا با (( مام کەلە شێر )) یش منەتی (( قووقاندنی )) تێدا نە بوو بێ. ١٢/٢/١٩٧٦

( ١ ) ــ ووشـەی ((کوردەوانـی Kurdewanî )) بە لای منـەوە، جوانتریـن و راستتریـن ووشەیەکە پـڕ بـە پێستی ووشـەی ((کوردۆلـۆجی Kurdology )) ی ئینگلیـزی، یا ((کوردۆلـۆگی Kurdologie )) ئەڵمانـی، یـا ((کوردەڤێـدێنـی КУРДОВЕДЕНИЕ)) ی رووسی . ئەم ووشەیەم لەسەر کێشی ((ئاشەوانـی )) و ((مەلەوانـی )) و ((فڕۆکـەوانـی )) و ((نەخۆشەوانـی )) و ... هتد دارشتـووە . ((ــوان -wan )) یا ((ــ ڤـان -van )) پاشگرێکە لە کوردی دا، نێـوی کـارا ((اسـم الفاعـل Nomen agentis )) لە نێـوی ئاسایی دروست دەکـا و ووشـەکە وا لـێ دەکـا، مانای ((خاوەنـی شتێـك )) یا ((ئیشێـك )) یا ((شارەزای کارێـك )) بگـەیـەنـێ .

برادەرێـك کە کاتـی خۆی لە زانستگـەی سلێمانـی کاربەدەست بوو، وای بـۆ گێرامـەوە کە هـەرچەندە ئـەم ووشەیـە ووشـەیـەکی زۆر جوانـە و پـڕ بە پێستی ماناکەیەتی، بەلام لەبەر ئەوەی هێندێ کە س لە سلێمانـی، سڵیان لەوە کردووەتەوە کە ئەم ووشـەیـە لـە ((سەگەوانـی )) و ((وورچەوانـی )) دەچـێ، ئەویـش زاتـی ئەوەی نەکردووە کە بەشـی کوردی یەکـەی زانستگـەی سلێمانـی نێـو بنـێ ((بەشـی کوردەوانـی ))، بەڵکـو نێـوی نـاوە ((بەشـی دیراساتـی کـوردی )) .

لێرەدا ــ بەش بە حاڵـی خـۆم ــ نازانـم بڵێـم چـی! ئایا هێندێ لەوانـەی ئـەم بەلپانـە دەگرن، ئەگەر بێتـو خوتووکـەی فیزیان بدەیـت و پـێیان بڵێیـت ((بە خـوا تـۆ پاڵەوانێکیـت بـۆ خۆت ))، ئایـە هیـچ پـێیـی پەسـت دەبـن، ئەگـەرچـی ووشـەی ((پاڵەوان )) یـش وەك ((سەگەوان )) و ((وورچەوان )) بە ((ــوان )) کۆتایـی هاتووە؟ ئەمەیان بـۆ ئەوانـەی قسـەی گووەرگە لەسەر نەبـوو دەرد مەترێنـن، ئەمجا با قسەیەکیش لەگەڵ ئەوانـە بکـەیـن کە خۆیا ن بە زانا و پێشـڕەوی گەل دادەنێـن و لە بەر خاتـری ساویلکـە و نەزانان، روو لە راستـی وەردەگێڕن . ئایا زانا و پێشـڕەو دەبـێ رێ پێشاندەر بـن، یا ریشـی خـۆیان بدەنـە دەسـت ئەوانـەی (سەرە واو) یان لە ووڕگـدا نـی یـە ؟؟؟

( ٢ ) ــ جەمال نەبەز : ((خـوێندەواری بە زمانـی کـوردی )) ــ بەغدا ١٩٥٧، ل ٥ ــ ١٣ .

( ٣ ) ــ ووشەی رادیـۆ و تەلەفزیۆنـم بە وێنەی ((رادوێ )) و ((تەلەفزوێن )) نووسی؛ چونکە بەشێکـی زۆر لە کوردەکانـی نێوەڕاستـی کوردستان، بڕگـە (مقطع) ی ((یـووyû یا یـۆ yo ))؛ بە تایبەتی لەو ووشە بێگانانەدا کە هاتوونەتە زمانی کوردی یەوە، دەیکەنە ((وێ wê )). بۆ وێنـە: بە ((یـوسف )) دەڵێن ((وێسف )) یا ((وێسـب )) و بە ((مەکاریـۆس )) دەڵێن ((مەکاروێس)) و بە ((ملیۆن )) دەڵێـن ((ملـوێـن )) و ... هتد .

( ٤ ) ــ تەماشای باسـی ئەم کۆنگرەیـە و ئامانجـەکانـی لەم دوو سەرچاوە رووسـی یەی خوارەوەدا بـکـە: بە داخەوە تایبەتیتری رووسیم دەست نەکەوت.

Олег Вильчевский + А.Ш. Шамилов: "О всесоюзной Курдоведческой Конференции"; Проблемы истории докапиталистических обществ, Ленинград 1934, №. 9-10 стр. 193-194.

О. Вильчевский: "Первая всесоюзная курдоведческая конференция и проблема литературного языка курдов СССР"; Язык и мышление, Хроника 6-7 стр. 333-337.

(٥) ــ تەماشای بڕیارەکانی "کۆنگرەی مامۆستایانی کورد لە شەقلاوە لە ١١ــ ١٣ی ئەیلوولی ١٩٥٩" بکە، لە گۆڤاری ((هیوا)) دا ــ بەغدا، ساڵی سێیەم، ژمارە ٢ی کانوونی یەکەمی ١٩٥٩ و ژمارە ٣ی کانوونی دووەمی ١٩٦٠. هەروەها تەماشای بڕیارەکانی کۆنگرەی دووەمی مامۆستایانی کورد لە ١٥ی ئابی ١٩٦١ دا بکە.

(٦) ــ چەند ساڵێك دەبێ، وشەی ((ئاینزا)) لە جیاتی ((مذهب)) ی عەرەبی بەکاردەهێنم. چونکە ((مذهب)) لکێکە لە ئاین جیادەبێتەوە، واتا زادەی ئاینە. وەك چۆن ((کوڕەزا)) زادەی کوڕە و ((میرزا)) زادەی میرە.

(٧) ــ بە ئاینی زەردەشتی دەگوترێ ((ئاینی مەزدایەسنی))، کە ئەمەش لە وشەی ((مەزد)) و ((یەسنا)) وە وەرگیراوە، (سەرنجی پەراوێزی ژمارە (٨) بدە).

(٨) ــ ((گاتاکان)) چەند سروودێکن کە لە بەشی یەکەمی ئاڤێستادا نووسراونەتەوە. ئاڤێستا خۆی پێنج بەشە: ١ ــ یەسنا. ٢ ــ یەشتەکان. ٣ ــ ڤیسپەرد. ٤ ــ ڤێندیداد. ٥ ــ وردە ئاڤێستا. ئەم بەشانە هەموو بە جارێ نە نووسراونەتەوە، بەڵکو لە چەند سەدەیەکدا تەواوکراون. دەڵێن بەشێك لە گاتاکان زەردەشت خۆی گوتوونی. ئەوەی شایانی باسە، بەشێکی زۆری ئاڤێستا یا هەمووی، لە هێرشی ئەسکەندەری مەکدۆنیی یۆنانی دا بۆ سەر ئێران لەنێوچووە و دوواییی لە دەوری فەرمانڕەوایی ی ئەردەشێری پابەکاندا (٢٢٤ ــ ٢٤١) لەم لا و لەو لا، جارێکی دی کۆکراونەتەوە. بەمەدا بۆمان دەردەکەوێ، ئەو زمانەی ئاڤێستای پێ نووسراوەتەوە، بە تەواوی ئەو زمانە نی یە کە زەردەشت خۆی قسەی پێ کردووە و ئاڤێستاش هەمووی بە قسەی زەردەشت نادرێتە قەڵەم. لێرەدا دەمەوێ بڵێم کە هێندێ لە نووسەرەکانمان لە جیاتی وشەی ((گاتاکان))، دەنووسن ((گاتاها)). ((ها)) نیشانەی گەل لە (علامة الجمع) لە فارسی ی تازەدا و تاکی ((گاتا ها)) دەبێتە ((گاتا)) و وشەی ((گاتاها)) وێنەیەکی ئاڤێستایی نی یە، بەڵکو فارسی ی تازەیە کە کوردی یەکەی ((گاتاکان)) ە.

(٩) ــ لەبەر ئەوەی کوردەکان زۆربەی زۆریان کۆچەر بوون و ئاینی زەردەشتیش داوای لە خەڵك دەکرد، ژینی کۆچەرایەتی بەربدەن و نیشتەجێ ببن، کوردەکان ئەم ئاینەیان بە دڵ نەبوو و لەسەر ئاینە کۆنەکانی خۆیان کە ڕۆژپەرستی و دارپەرستی و پەرستنی بتی لە سەردوستکراو بوو، ماوەیەکی زۆر مانەوە. بێجگە لەوەش زەردەشت داوای لە خەڵك دەکرد بە کشتوکاڵەوە خەریك ببن و گاو گوێرەکە پەروەردە بکەن. ئەمەش بۆ کوردی کۆچەر دەستی نەدەدا، لەبەر ئەوە کوردەکان لەسەرەتاوە زۆر بەربەرەکانێ ی زەردەشتیی یان کرد و زەردەشتیان لە وڵات دەربەڕاند.

(١٠) ــ تەماشای:
(١) ــ هاشم رضی: ((زرتشت وتعالیم او)) ــ تهران ١٣٤٤ ل ١٥٣ (بە فارسی).
(٢) ــ Walther Hinz: "Zarathustra", Stuttgart 1961 (بە ئەڵمانی)

(١١) ــ جمال نبز: ((حول المشكلة الكردية)) ــ من منشورات ((الاتحاد القومي للطلبة الاكراد في اوروبا)) ــ مونيخ ١٩٦٩ ص ٦ ــ ٧. دیسانەوە:
Jemal Nebez :"Kurdistan und seine Revolution", Publication der NUKSE, München 1972, S. 58-59. (بە ئەڵمانی).

(١٢) ـ یەزیدی یەکان بە خۆیان دەڵێن ((ئێزدی Êzdî ))، لەبەر ئەوە منیش هەروام نووسی . دوور نی یە ووشەی ((ئێزد Êzd )) هەر لە ووشەی ئاڤێستایی ((ئیزەد Îzed ))ەوە هاتبێ . چونکە لە ئاینی زەردەشتی دا بەو فریشتانەی کە پایەیان لە پایەی حەوت فریشتە؛لە ئاهورامەزدا نزیکە کە؛ واتا ((ئەمشاسپەندان Emşaspendan/A-meša-spand)) نزم تر بووە،دەگوترا ((ئیزەد)) ؛ کە لە فارسی ی ناوەڕاست و فارسی ی تازە و کوردی ی ئەمڕۆدا بووە بە ((یەزدان)) و بە مانای ((خوا / خودێ)) بەکاردێ . بێگومان،ئەم بۆچوونە زۆر ڕێی تێ دەچێ؛ چونکە ئێزدی یەکان ((فریشتە تاووس)) واتا "تاووسی مەلەك" دەپەرستن . بۆ زانیاری ی پتر لەبارەی ئێزدی یەکانەوە تەماشای ووتاری نووسەر بکە بە ئەڵمانی لە لێکسیکۆنی جیهانی ئیسلامدا :

Jemal Nebez: "Jeziden", im "Lexikon der Islamischen Welt", Stuttgart, Kohlhammer Verlag 1974, S. 67-68.

(١٣) ـ ((ئەهلی هەق)) کە لە کوردستانی عێراقدا هێندێ جار ((کاکەیی)) یان پێ دەڵێن و لە کوردستانی ئێراندا بە ((ئەهلی هەق)) و لە نێو فارسەکان و هێندێ جار لای عەرەب و تورکیش بە هەڵە بە ((علی اللاهی)) ناو دەبرێن ؛ ئاینەکەیان لە گەلێ ڕووەوە لە ئاینی ئێزدی دەچێ . بە پێی ئەو چیرۆکانەی کە کاکەیی یەکان دەیگێڕنەوە ؛ سەرۆکی ئەم ئاینە ناوی ((ئیسحاق)) بووە و ئەویش کوڕی شێخ عیسێ ی بەرزنجەیی بووە . بە قسەی ((ئەهلی هەق))ی ناوچەی گۆران (لە کوردستانی ئێران)؛دامەزرێنەری ئاینی نوێ ی ((سوهاك))ە و خەڵکی ناوچەی زاگرۆسە و لە دایکێك هاتووەتە جیهانەوە کە فریشتە بووە و ناوی ((ڕەمزبار)) ـ واتا نهێنی هەڵگر ـ بووە و گوایە گیانی ئەم فریشتەیە چووە بەر کچە جانێکدا کە بە پێی چیرۆکی کاکەیی یەکان ئەو کچە جافە بە سەرزاری دایکی ((سوهاك)) و ژنی ((شێخ عیسێ)) بووە . هەرچەندە شێخ زۆر بە پیری هانیوێتی؛لەگەڵ ئەوەشدا ئەو منالە هاتووەتە جیهانەوە . بە کورتی ((سوهاك)) یا ((سوڵتان سوهاك)) خوای ((ئەهلی هەق))ە و لە دایك بوونیشی لە لە دایك بوونی عیسا دەچێ لە مەریەم . تەنانەت دەشڵێن ((ڕەمزبار)) گیانی ((مەریەم))ی کراوە بەبەردا . کاکەیی یەکان لە ((سوهاك)) چەند مۆزاتێکی ((معجزة)) سەیر دەگێڕنەوە . لەوانە گوایە ڕۆژێکیان کە دارەڕای مزگەوتەکەیان کردووە لە بەرزنجە؛دیویانە دارەکان کورتترن لە ماوەی نێوانی دیوارەکان . ((سوهاك)) گوتوو یەتی ((کاکە بیکێشە)) و لەوەوە دارەکە بە فەرمانی خوا کشاوە و هەر لەوەشەوە ناوی ((کاکەیی)) یان بەسەردا براوە . هەرچی چۆنێك بێ کاکەیی یەکانیش وەك ئێزدی یەکان بڕوایان بە ((برای ئاخیرەت)) هەیە . واتا پیاو دەتوانێ هەر لەئێستەوە بۆ پاشمردنی،برایەك بۆ خۆی هەڵبژێرێ و پێی بڵێ ((کاکە))؛کە دوور نی یە ناوی ((کاکەیی)) لەمەیانەوە هاتبێ .

((ئەهلی هەق)) پێیان وایە کە تیشکی خودایی لە حەوت وێنەدا خۆی دەردەخا کە ((سوڵتان سەهاك)) یەکێکە لەو وێنانە . هەروەها باوەڕیان وایە کە هەرچەندە خوا جیهانی دروست کردووە و هێناویەتە بوون،بەلام خۆی ڕاستە وخۆ نایبا بەڕێوە ، بەڵکو بە هۆی چوار یا پێنج فریشتەوە حوکمی دەکا ؛ کە ناویان ((یارانی چارمەلەك))ە . سەرکردەی فریشتەکان ناوی ((بنیامین))ە؛کە ئەمیان هەموو

جیهانی بە دەستە و لەگەڵ خوادا پەیمانێکی بەستووە. (( ئەهلی هەق )) دەڵێن گوایە ئەوان نوێنەری بنیامینن لەسەر ئەرز. هەروەها دەڵێن کاتێ کە پەیامبەری ئیسلام (( محەممەد )) چووە بۆ لای خوا بۆ (( میعراج ))؛ خوا سیو دوو جزمی قورئانی بۆ راگەیاندووە و پێی گوتووە کە تۆ بە موسوڵمانان تەنیا سی جزمی بڵێ و دووانەکەی دیان بۆ مەڵێ، چونکە ئەو دووانە (( نهێنیی خوایەتی )) یان تێدایە. لەبەر ئەوە (( محەممەد )) ئەو دوو جزمەی تەنیا بە دوازدە ئیمامەکەی شیعەکان راگەیاند. بەڵام جوبرائیل کە خۆی (( فریشتە بنیامین ))ە، بە زمانی کوردی ئەو (( نهێنیی خوایەتی )) یەی بە (( ئەهلی هەق )) راگەیاند. سەبارەت بەمەیە کە هەر ئەوانن (( نهێنیی خوایەتی )) دەزانن و ناشبێ بیدرکێنن و بەمەش دەڵێن (( نهێنی مەڵێ )). (( نهێنیی خوایەتی )) بە پێی ((ئەهلی هەق )) وا لە چیای داڵەهوو لە کوردستان، چونکە (( سوڵتان سوهاك )) واتا خوا، بۆ یەکەم جار لەوێ لە شێوەی شا بازێکدا، لەگەڵ یارانی بەیەك گەیشتن. (( ئەهلی هەق ))، وەك ئێزدییەکان بڕیان وایە کە مرۆڤ مرد، گیانەکەی دەچێتە لەشێکی دییەوە، واتا بڕوایان بە ((تناسخ الارواح )) هەیە؛ کە بە کوردی (( دۆنا دۆن )) ی پێ دەڵێن. (( دۆن )) بە مانای (( بەرگ )) بەکاردەهێنن و (( دۆنا دۆن )) یش؛ "بەرگ گۆڕین" دەگرێتەوە. بە قسەی (( ئەهلی هەق ))؛ (( شەیتان )) شتێکە هەر بۆ پیاوی خراپ دروست کراوە. واتا هەرکەسە خۆی شەیتانی خۆیەتی. بڕواشیان وایە، ئەوانەی لەم دنیا نەرمانڕەوا و بووە و دەسەڵاتدارن، لە پاشمردنیان زۆر ئازار دەدرێن. جا لەبەر ئەوەی ئەمانیش وەك ئێزدییەکان زۆر بە نهێنیی ئاینەکەیان بڵاو دەکەنەوە؛ لە ترسی پەلا ماردانی تەنگەتیلکە و نەزان و بەرچاو- تەنگ، دیارە گەلێك بوختان و درو و دەلەسەیان بۆ ڕێك خستوون؛ وەك (( شەوەڕەش )) و (( چرا پف )) و لەو بەیتوبالۆرانەی کە بە خوتوخۆڕایی و ناڕەوا خراونەتە دووای ئێزدییەکان و شەبەکەکان و هەقەکان و کۆمەڵە نهێنییەکانی دی. ئەوەی شایانی باسە ئەوەیە؛ (( ئەهلی هەق )) بە هیچ جۆرێك ((علی اللاهی )) نین. (ئیسحاق) یا ( سوهاك ) بەلایانەوە، پایەی ڕێزی گەلێك بەرزترە لە هی ئیمامی عەلی. ئاینی (( ئەهلی هەق ))، وەك ئاینی ئێزدی و شەبەك ( شەوەك ) لەسەر بنچینەی ئاینە کۆنەکانی کوردی پێش زەردەشت دامەزراوە، ئەگەر چی تێکەڵ بە ئاینی زەردەشتی و جوولەکەیەتی و دیانەتی و موسوڵمانەتی بووە. (( ئەهلی هەق )) چەند کتێبێکی پیرۆزیان هەیە کە زۆربەی بە فارسی یە و هێندێکیشی بە کوردی و بەشێکی کەمیشی کراوە بە تورکی. بە نێوبانگترینی ئەمانە (( شاهنامۀ حقیقت ))ە کە لە ساڵی ( ١٣١٨ / ١٩٠٠ ی ز.) دا لە لایەن یەکێك لە سەرۆکەکانی ئەم ئاینەوە، کە نێوی حاجی نیعمەتولڵای جەیحوونئاوایی موکری ( ١٨٧١ ــ ١٩٢٠ ) یە، بە هۆنراوەی فارسی نووسراوەتەوە. بیروباوەڕی (( ئەهلی هەق )) ئاینێکی سەربەخۆیە و ئاینزای هیچ ئاینێکی دی نی یە.

( ١٤ ) ــ (( شەبەك )) یا (( شەوەك )) تیرەیەکی کوردن؛ ژمارەیان لە شەست هەزار کەس تێپەڕ نابێ. ئاینەکەیان هەروەك ئاینی ئێزدی و کاکەیی و هەقە، ئاینێکە لەسەر بناخەی ئاینە کۆنەکانی کورد دامەزراوە. ئەحمەد حامید سەراف لە کتێبەکەی دا کە نێوی (( الشبك ــ من فرق الغلاة فی العراق )) ە ـ بەغدا، ١٩٥٤؛ سا یا بە هەڵەی نەزانین، یا بە ئەنقەست، شەبەکی بە تورك داوەتە قەڵەم. راستی یەکەی ((شەبەك )) کوردن و رەنگە نێوەکەشیان لە (( شوانکارە )) وە هاتبێ، کە بە عەرەبی بووە بە ((شَبَنْکارَة )).

(١٥) ـ شێخ عەبدولقادری گەیلانی (١٠٧٧ ـ ١١٦٦) دامەزرێنەری تەریقەتی قادرییە. ئەم تەریقەتە بە هۆی شێخ مارفی نۆدێی بەرزنجەیی (١٧٥٣ ـ ١٨٣٨) یەوە لە کوردستاندا بڵاو بووەوە. مریدەکانی ئەم تەریقەتە پێیان دەگوترێ ((دەروێش)).

(١٦) ـ مەولانا خالیدی نەقشبەندی (١٧٧٩ ـ ١٨٢٦) خەڵکی سلەیمانییە و بڵاوکەرەوەی تەریقەتی نەقشبەندییە لە کوردستاندا. تەریقەتی نەقشبەندی خۆی لە لایەن محەممەد بەهائەددینی بوخاری (١٣١٧ ـ ١٣٨٩) یەوە دامەزرێنراوە. لایەنگرانی ئەم تەریقەتە لە کوردستان، پێیان دەگوترێ ((سۆفی)).

(١٧) ـ حاجی کاك ئەحمەد یەکێکە لە پێشەوایانی موسوڵمانانی کوردستان و یەکێکە لەوانەی کە ئەو هەموو "مۆزات" (معجزة) ی لێ دەگێڕنەوە. دەڵێن گوایە باوکی چەند ساڵێك لە پێش لەدایك بوونی دا، مژدەی هاتنە جیهانی بە خەڵك داوە و کتێبی ((ئەحمەدی)) بۆ نووسیوەتەوە تاکو فێری زمانی عەرەبی بکات، لە کاتێکدا باوکی ئەوەندە پیر بووە، کەس چاوەڕوانی ئەوەی لێ نەکردووە کە منالی ببێ. هەر بە لاوێتی بە فەرمانی باوکی چووە بۆ حەج و لە کەعبە چاوی بە پیاوچاکێکی خەڵکی مەراکیش کەوتووە و لەوەوە فێری زانستی تیپەکان (علم الحروف) و نرخی ژمارە (قیم الاعداد) و جەفرناسی بووە و کە گەڕاوەتەوە سلێمانی ((گوللەبەند)) ی دروست کردووە و بەوە زۆر کەسی لە مردن رزگار کردووە. هەروەها دەگێڕنەوە کە سوڵتان عەبدولحەمیدی دووەم (١٨٧٦ ـ ١٩٠٩) کاتێ کە ئەرمەنییەکان لە رۆژی ٢١ / ٧/ ١٩٠٥ دا ویستوویانە بە بۆمبا بیکوژن، بۆمباکە کاری لێ نەکردووە، چونکە گوایە ((گوللەبەند)) ی حاجی کاك ئەحمەدی بە خۆیەوە بەستووە ...

(١٨) ـ سەعیدی نوورسی لە گوندی ((نوورس)) لە ناوچەی بیتلیس لە دایك بووە. لەسەردەمی لاوێتی دا لە بزووتنەوەی ئازادیخوازانی کوردستانی ژووروودا هاوبەشی کردووە. نوورسی یەکێکە لە بلیمەتە هەڵکەوتووەکانی رۆژهەڵات و لە موسلیحە بە نێوبانگەکانی ئاینی ئیسلام، هیچ چەپی نییە لە جەمالەددینی ئەفغانی (کە ئەویش کوردە و خەڵکی ئەسەداوای کوردستانی ئێرانە). نوورسی بۆ بڵاوکردنەوەی تەریقەتەکەی خۆی پتر لە سەد و پەنجا نامیلکە و کتێب و ووتاری بە زمانی تورکی بڵاوکردووەتەوە، بە نێوبانگترینیان نامیلکەی ((ریسالەی نوور)) ە. نوورسی لە تورکیا و ئێران و پاکستان و هیندستان و ئەورووپا مریدی یەکجار زۆرە و مریدەکانی بە نێوی ((بدیع الزمان)) ەوە نێوی دەبەن. نوورسی هەر لە پێش جەنگی جیهانیی یەکەمدا، دەیویست زانستگەیەك لە شاری ((وان)) دروست بکا، وەك زانستگەی ئەزهەر، کە بە کوردیش دەرزی تێدا بووترێتەوە و توانی خەلیفەی تورکیش بەم کارە رازی بکا، بەڵام هەڵگیرسانی شەڕ بوو بە هۆی سەرنەگرتنی ئەم ئامانجەی. ئەم کوردە تێکۆشەرە زۆر زەحمەتی دی بە دەست کاربەدەستانی رەگەزپەرستی تورکیاوە، کە هەموو جارێ بە نێو و ناتۆرەی ((جیابوونەوە خوازی)) و ((کوردایەتی کردن)) و ((لافی پێغەمبەرێتی لێ دان)) و ((مێشك تێکچوون)) و ((ریسواکردنی ئەتاتورك)) و ((ئاژاوەنانەوە)) و ((نۆکەری کردنی رووس)) و ... هتد دەیاندا بە دادگە و بە بێ بەڵگە و ئیسپاتی، لە کوردستان دووریان دەخستەوە و ئازاریان دەدا. سەعیدی نوورسی کە لە سەرەتای ژیانی دا خۆی نێو نابوو ((سەعیدی کوردی))، هەتا مرد جلی کوردی فڕێ نەدا. چەند جارێکیش فتوای ئەوەی دا کە کورد مافی ئەوەیان هەیە بە زمانی خۆیان بخوێنن و بنووسن و قسەبکەن و وەك کورد بژین و بمێننەوە، لەبەر ئەوە چقڵی چاوی رەگەزپەرستانی تورك بوو. بە زمانی تورکی هەزاران نامیلکە و ووتار هەن کە بۆ پشتگیری یا دژی نوورسی نووسراون.

لە ساڵی ( ١٩٦٠ ) دا و لە کاتێکدا کە لە گەشتێك بە ڕۆژاوای تورکیادا دەگەڕایەوە بۆ کوردستان، لە تەمەنی هەشتاوحەوت ساڵی دا لە (( ئۆرفە )) کۆچی دوایی کرد لە هەڵێکی دی دا باسێکی گەورە و شیکەرەوانە لەسەر نووسی و نووسێتی بلاّو دەکەمەوە ئەوانەی تورکیش دەزانن، با جارێ ئەم کتێبەی خوارەوە بخوێننەوە :

Necip Fazıl Kısakürek : "Son devrim din mazlumları", Istanbul 1970.

(١٩) ــ عەلی تەرەماخی : (( دەستووری زمانی عەرەبی بە کوردی )) ، لێکۆڵەرەوە و بڵاوکەرەوەی : دوکتۆر مارف خەزنەدار ــ بەغدا ١٩٧١ ، ل ٢٥ .

(٢٠) ــ تەماشای پێشەکی یەکەی (( ئەحمەدی )) بکە کە شێخ مارف بە هۆنراوەی فارسی نووسیویەتی و گوتوویەتی :

تا کە فرزندم احمد بی تعب × شود دانای لغات عرب

(٢١) ــ تەماشای ئەم دوو "وتارە"ی خوارەوە بکە :

1- Ismet Vanli: "The Question of the Unification of the written Kurdish Language: Kurmanji or Sorani" in:"Kurdistan" (organ of the Kurdish Students Society in Europe), November 1959, p.5-10.

2- Ismet Sherif Vanly: "The Question of the Unification of the Kurdish Language exists: Kurmanji or Sorani ?", London, March 1960.

(٢٢) ــ تەماشای وتاری (( استطلاع رأی )) لە گۆڤاری (( ڕۆژی کوردستان / شمس کردستان )) دا بکە، ژمارە ( ٣ ) ، ساڵی ( ٢ ) ، مارتی ١٩٧٣ ، ل ٧ .

(٢٣) ــ محەمەدی مەلا کەریم : (( بەرهەمی ئەم چەند ساڵەی بزووتنەوەی ڕۆشنبیریی کورد و پەلانێك بۆ لەمەو پاشمان )) لە گۆڤاری (( ڕۆژی کوردستان / شمس کردستان )) دا ، ژمارە ( ٤ ) ، ساڵی ( ٢ ) ، حوزەیرانی ١٩٧٣ ، ل ٤٦ .

(٢٤) ــ جارێکی دی ئەوە دێنمەوە بیر کە ئەم نامیلکەیەم بۆ یەکەمجار لە مانگی شوباتی ١٩٧٤ دا بۆ چاپ ئامادە کردووە . جا هەرچەندە باری سیاسی کوردستان زۆر گۆڕاوە، بەلاّم لەگەڵ ئەوە شدا وەنەبێ ناوەڕۆکی ئەم قسەیە ئەوەندە گۆڕابێ .

(٢٥) ــ جەمال نەبەز : (( نووسینی کوردی بە لاتینی )) ، بەغدا ١٩٥٧ ، ل ط ــ ك .

(٢٦) ــ جەمال نەبەز : (( خوێندەواری بە زمانی کوردی )) ، بەغدا ١٩٥٧ ، ل ٣١ ــ ٣٤ .

(٢٧) ــ ئەوەی شایانی باسە ئەوەیە هێندێك لەو زاراوەیانە بە داخەوە بە هەڵە لە لایەن خەڵکەوە وەرگیران و بەکارهێنران . لەبەر ئەوە ناچار بووم لە ( ١٩٦٠ ) دا ڕیزە وتارێك لە گۆڤاری (( ڕۆژی نوێ )) دا بنووسم ؛ کە هاوڕێی مناڵیم جەمال شالی دەری دەکرد ، ( تەماشای ژمارە ٦ و ٧ و ٨ ی ساڵی یەکەم بکە ــ ئەیلوول و تیشرینی یەکەم و دووەمی ١٩٦٠ ) و لەوێ دا ئەو زاراوەیانەی دروستکرابوون ، بیان خەمە ژێر وورد مبینی لێکۆڵینەوەوە . ئەم ڕیزە وتارەم بە و زاراوەیانە دەست پێ کرد کە لیژنەی ماتماتیك ( ریاضیات ) دروستی کردبوو . بەلاّم داخستنی گۆڤاری (( ڕۆژی نوێ )) لە لایەن حکوومەتی قاسمەوە ، ڕێی لەوە گرت ئەم کارە تا سەر بە ئەنجام بگەیەنم . دوورکەوتنەوەشم لە کوردستان ؛ هۆ یەکی دی بوو بۆ تەواونەکردنی ئەو باسە کە بە هیوام ڕۆژێك بێ ؛ دیسانەوە تێی هەڵبچمەوە .

(٢٨) ـ لە شوێنی خۆی دا مانا و مەبەستی ئەم وشە بێگانانە لێك دەدەینەوە ·

(٢٩) ـ لێرەدا مەبەستم ئەوە نی یە خوانەخواستە لە سەروبۆتەلاکی کەس بدەم، یا نێوی هیچ کەسێك بە نا ڕەوا بە سارد و سووکی بەرم · بەڵام شتێکی ئاشکرایە و هەموو کوردێکی بە ڕۆمە تیش دانی پێدادەنێ کە بەرەی سەر لێ شێواو و هەڵمەتە کاسە و داگیرکەر پەرستی کورد، بە سەرۆکایەتی ی دەرەبەگ و وورد مبۆرجوازی یە مۆڵ خواردووەکانی نێو پارتی دێموکراتی کوردستان و بە پێی پیلانێکی وورد رێکخراو لە لایەن دوژمنانی گەلی کوردەوە، بە تایبەتی دووای رێکەوتنەکەی ١١ ی مارتی ١٩٧٠ ، هەلیان بۆ هەڵکەوت و خۆیان کردە میری سەر بڕ و ڕێیان لە گەشە کردنی هەموو جۆرە بیرێکی سەربەست و پێشکەوتنخواز لە کوردستاندا گرت و ئەو داو و دەزگایانەی کە بە خوێنی هەزاران جۆتکار و سەپان و ژن و منداڵ و ڕۆشنبیری شۆڕشگێڕی کورد دامەزرابوو، لە جیاتی ئەوەی بۆ بەرزکردنەوەی پایەی خوێندەواری و ڕووناکبیری گەل بەکار بهێنرێن، هێندێکیان بە دیاری دران بەکوتەخوێندەواری ماستاو ساردکەرەوەی کلك هەڵسەنگێن · هەر لەبەر ئەوەش بوو، هی وا کەوتە ((کۆڕی زانیاری کورد)) ەوە کە جێی یەکانیان تەنیا وەك پاداشی کلکەلەقێیان بۆ کاربەدەستی نا دڵسۆز و سەرکردە کوردی نەزانەکانی پارت، پێ بەخشرابوو · ئەگەرچی لە قانوونی ((کۆڕ)) دا ـ کە پارتەکان خۆشیان لە دانانی دا بەشدار بوون، ئاشکرا نووسراوە، ئەو کەسەی دەکرێتە ئەندام، دە بێ زمانی کوردی زۆر باش بزانێ ·

(٣٠) ـ لە دووایی دا بیستم کە "کۆڕ" ئەم کارەی کردووە · بە مەدیارە یەکێك لە پێویستی یەکانی سەرشانی خۆی بە جێ هێناوە، ئەگەرچی نازانم ئەوانەی نێرراون لەسەر چ بنچینەیەك هەڵبژێرراون ·

(٣١) ـ لورەکان بە بیروڕای مێژوونووسانی بەنێوبانگی خۆمانەی وەك بیتلیسی و بێگانەی وەك (المسعودی) و (ابن قتیبة) و (الطبری) و (راولنسن) و (ریچ) و ··· هتد، هەر لە کۆنەوە بە کورد ناسراون · لورەکان خۆشیان لەسەر ئەو باوەڕەن · بۆ وێنەیەکی پێ و بوێری بە فەیلی یەك بڵێ: ((تۆکورد نیت))! · شایانی باسە، چەند ساڵێك پێش جەنگی جیهانی یەکەم، ئۆسکارمانی ئەڵمانی لە نەزانینەوە، شێوەی لوری لە زمانی کوردی جیاکردەوە · لەم دووایی یەشدا، هێندێ کورد، کە دڵنیام هیچ کاتێك نەیانتوانیوە تێکستێکی لوری بە پێی زانستی زمانەوانی، بەراوردکاری شی بکەنەوە، خەریك بوون لە ڕێی چاولێکەری ی کوێرانەوە لور لە کوردێتی "بخەن" · ڕاستی یەکەی لوری ڕاستەقینە کوردن. بەڵام ئەوە هەیە هێندێ هۆزی پێیان دەگوترێ "لور" کەچی مافیان بە لورەوە نی یە · لە نامیلکەیەکی دی دا دێمەوە سەر ئە باسە.

(٣٢) ـ ئەم دۆخە بە زمانی لاتینی و لە زانستی زمانەوانی دا پێی دەڵێن:

(( casus rectus))

(٣٣) ـ ئەم دۆخە بە زمانی لاتینی و لە زانستی زمانەوانی دا پێی دەڵێن:

(( casus oblicus ))

(٣٤) ـ "هۆن hon" لە هێندێ زاراوای شێوەی کرمانجی ی ژووروودا، دەبێتە "هوون hûn" و لە زاراوای هەولێر و دەوروبەری هەولێردا دەبێتە "ئەنگۆ engo" ·

(٣٥) ـ بەکار هێنانی ئەو کەوانە، مانای وایە کە پیاو دەتوانێ یا ((ئەو)) بەکار بهێنێ، واتا بێ ((انە))، یا هەموو وشەکە، واتا ((ئەوانە)) بەکار بهێنێ · کە واتە مەبەست ئەوەیە کە ((ئەو)) و ((ئەوانە))، هەردووکیان ڕاستن و بۆ یەك شت بەکار دەهێنرێن ·

( ٣٦ ) ـ هێندێ جیاوازیی کەم لە نێوان زاراواکانی شێوەی کرمانجیی ژووروودا هەیە . ئێمە لێرەدا تەنیا زاراوای جزیرە کە بووە بە زاراوایەکی ئەدەبی ئەو شێوەیە ، دەکەینە نموونە . شایانی باس ئەوەیە کە گەردانکردنی ئەم جۆرە نیوانە لە شێوەی کرمانجیی ژووروو و کرمانجیی نێوەڕاستدا جیاوازییەکی یەکجار کەمی هەیە . بۆ وێنە :

| Kirmancî Jûrû | Kirmancî Nêweřast |
| --- | --- |
| ez kurdim | min kurdim |
| to kurdî | to kurdî(t) |
| ew kurde | ew kurde |
| em kurdin | ême kurdîn |
| hon kurdin | êwe kurdin |
| ew kurdin | ewan kurdin |

تەنیا جیاوازییەك کە هەبێ لە کەسی یەکەمی کەلدایە کە لە شێوەی ژووروودا "em Kurdin" لە جیاتی "ême Kurdîn"ە.ئەم جیاوازییە جیاوازییەکی گەورە نی یە و لە هەموو زاراواکانی شێوەی ژووروشدا باو نی یە . بۆ وێنە لە هێندێ جێ دەڵێن "em Kurdîn" وەك کرمانجیی نێوەڕاست.

ئەوەی شایانی باسە ئەوەیە وێنەی نا (نفی) ی هەردوو شێوەکە لە یەك ناچن . بۆ وێنە :

| Kirmancî Jûrû | Kirmancî Nêweřast |
| --- | --- |
| ez ne Kurdim | min Kurd nîm |

بە لای منەوە ، بەکارهێنانی (نە) لە جیاتی (نی یە) چێترە . ئەم وێنە یە تەنانەت لە ئەدەبیاتی شێوەی کرمانجیی نێوەڕاستدا،لە سەدەی پێشوودا،بەکارهێنراوە . بۆ وێنە حاجی قادری کۆیی دەڵێ :

ئەهلی جەننەت نە شوان و گاوانە × ساحێبی عیلم و فەن و عیرفانە

کە واتە بووترێت : ((نە ئەزم)) ، ((نە تویت)) ، ((نە ئەوە)) ... هتد لە جیاتی ((من نیم)) ، ((تۆ نیت)) ، ((ئەو نی یە)) و ... هتد .

ئەمەی سەرەوە وێنەیەك بوو بۆ گەردان کردنی جۆرە نێوەکەسی یەکان،کە تێ ئاوەڵنێو (لێرەدا کورد) بە تیپێکی بێ دەنگ کۆتایی هاتبێ . بەڵام ئەگەر ئاوەڵنێو بە تیپێکی دەنگدار کۆتایی بێ( بۆ وێنە: برچی = برسی )،بەم جۆرەی خوارەوە گەردان دەکرێ:

| Kirmancî Jûrû | Kirmancî Nêweřast |
| --- | --- |
| ez birçî me | min birsîm(e) |
| to birçî yî | to birsî(t)(e) |
| ew birçî ye | ew birsîye |
| em birçî ne | ême birsîn |
| hon birçî ne | êwe birsîn |
| ew birçî ne | ewan birsîn |

ئەگەر سەرنجێکی وورد ی ئەمەی سەرەوە بدەین، دەبینین جیاوازیەکی بنچینەیی لە نێوانیاندا نی یە. بە تایبەتی ئەگەر ئەوە بخەینە بەرچاومان کە، لە هێندێ زاراوای کرمانجی ی نێوەڕاستدا، لە جیاتی: (ئێمە برسین) و (ئێوە برسین) و (ئەوان برسین) دەگوترێ: (ئێمە برسینە) و (ئێوە برسینە) و (ئەوان برسینە). هەروەها لە سەرێکی دی یەوە نابێ ئەوەمان لە بیر بچێ کە هێندێ ئاوەڵناو (صفة) هەن لە کرمانجی ی نێوەڕاستدا، کە بکەونە پاش جێ نێوی کەسی یەوە و لەگەڵی گەردان بکرێن، وەك کاری تێپەڕ گەردان دەکرێن، نەك وەك "ئاوەڵناو" ــ بۆوێنە: لە کاتێکدا دەگوترێ: ((ئێمە برسین))، ((ئێوە برسین))، ((ئەوان برسین))؛ دەشگوترێ: ((ئێمە برسیمانە))، ((ئێوە برسیتانە))، ((ئەوان برسی یانە)). ئەمەش تەنیا بۆ چەند ئاوەڵناوێکی کەمە، وەك ((برسی)) و ((تینوو)). لەبەر ئەوە بە بیروڕای من، لە کاتی گەردانکردنی ئەم جۆرە نێو و ئاوەڵناوانەدا، دەبێ تەنیا ئەو وێنەیەیان لە نووسیندا بەکار بهێنین کە لە هەردوو شێوەکەدا لەیەکەوە نێزیکن.

(٣٧) ــ تەماشای دەمکاتی هاتوو بکە (ل ٤٤ ــ ٤٦).

(٣٨) ــ تەماشای باسی نێر و مێ بکە (ل ٢٧ ــ ٢٨).

(٣٩) ــ ووشەی ((خەسوو)) لەم دەستوورە بەدەرە. واتا ناگوترێ ((خەسووێ)) چونکە ((خەسوو)) و ((خەزوور)) هەردووکیان لە زمانی ئێرانی ی کۆندا، هەر یەك بوون و لە بنەڕەتدا بۆ هەردووکیان یەك ووشە بەکار هێنراوە. ئێستەش لە فارسی ی تازەدا ووشەی ((خەسورە xosûre)) بۆ ((خەزوور)) یش و ((خەسوو)) ش بەکار دەبرێ. هەروەها ووشەی ((دادە)) ش لەم دەستوورە بەدەرە. واتا ناگوترێ ((دادێ))، هەرچەند ووشەی ((دایێ)) ــ واتا (دایە) ش هەیە. چونکە (دادە) لە (دادا) ی فارسی یەوە وەرگیراوە هەرچەندە لە فارسی دا (دادا) بۆ (دایەن) بەکار دێ.

(٤٠) ــ ئەم ئامرازە لە زاراوای فەیلی دا هەر ((کە)) یە بۆ نێر و مێ. بەلام لە هەورامی دا (کە) بۆ نێرە و (کێ) بۆ مێ یە. هێندێ جار (کە) لە زاراوای فەیلی دا دەبێ بە (گە)) بۆوێنە دەگوترێ ((حەسەن زگ زلێگە))، واتا (حەسەن زگ زلێکە).

(٤١) ــ بەلام پاشماوەی ئەمە ماوە. بۆ وێنە، لە جیاتی ((مێرەکە)) دەگوترێ ((مێرك)) و لە جیاتی ((ژنەکە)) دەگوترێ ((ژنك)) و لە جیاتی ((کچەکە)) دەگوترێ ((کەچك)). واتا ئامرازی ((ik -)) بەکار دێ لە جیاتی ((ke -)). لە هێندێ زاراوای سۆرانی دا ((کە)) بۆ نێر و ((کێ)) بۆ مێ بەکار دێ. بۆ وێنە: دەگوترێ ((بەشی ژنەکێم بدە)) لە جیاتی ((بەشی ژنەکەم بدە)). هەروەها ئامرازی ((کە)) لە زاراوای ((سوورچی)) و ((هەرکی)) دا کە دوو زاراوای شێوەی کرمانجی ی ژوورووین لە دۆخی گێڕانەوەدا narrative condition ماوە.

(٤٢) ــ هێندێ جار لە زاراوای ئەردەڵاندا ((گەل)) و ((یەل)) یش وەك ئامرازی کردنەگەل (اداة الجمع) بەکار دەبرێن. بۆ وێنە، دەگوترێ: "کورگەل"، "گایەل" لە جیاتی "کوران" و "گایان". لە شێوەی گۆرانی دا ئەم ئامرازە دەبێتە ((کەهـ keh-)). بۆ وێنە "پیا" ــ واتا "پیاو" (تاکە) و "پیاگەهـ"، واتا پیاوان، (کەلە).

(٤٣) ـ چاوگەکان (المصادر) لە هەردوو شێوە بنچینەییی یەکەدا، هەروەک کارەکان وان. واتا ئەوانیش پێنج جۆرن. تەنیا ئەوەیە ئەو کارانەی کە لە کرمانجیی نێوەڕاستدا بە (din-) کۆتاییان دێ، ئەم (din-)ە لە کرمانجیی ژووروودا دەبێتە (in-) ـ بۆ وێنە: (kirdin) دەبێتە (kirin). چاوگەکانیشیان هەر وایان لێ دێ.

(٤٤) ـ (bila) یا (bira) لە کرمانجیی ژووروودا، هەردووکیان بەرامبەر بە (ba) یا (bam)ی کرمانجیی نێوەڕاستن.

(٤٥) ـ دەبێ بزانین کە ڕابوردووی ئەو کارە تێنەپەڕانەی بە (in-) یا (în-) یا هاوتاکانیان (iyan-) و (ihan-) کۆتاییان دێ، یا بە (an-) و (ûn-) تەواو دەبن، هەموو یەک دەستووریان هەیە. ئەوەش ئەوەیە (ن)ی چاوگە لادەبرێ و بەوە دەبێتە کەسی سێیەمی ڕابوردوو. بۆ وێنە: ((هاتن ـ هات))، ((چوون ـ چوو))، ((مان ـ ما))، ((ڕیان ـ ڕیا))، ((بەزین ـ بەزی)) و ... هتد.

(٤٦) ـ دەبێ بزانین کە (divê) هێندێ جار بە مانای (debê) پیش دێ. بۆ وێنە: (ez divê herim) واتا (من دەبێ بڕۆم).

(٤٧) ـ ((چوون)) کارێکی تاک هەڵکەوتوو (شاذ)ە و زۆر کۆنە و لەگەڵ (شدن)ی فارسیدا ڕەگیان یەکە (سەرنجی "آمد و شد"ی فارسی بدە). ((چوون)) لە شێوەی زازادا، بە وێنەی ((شین)) ماوە، کە ئەمەش وێنەیەکی زۆر کۆنە.

(٤٨) ـ هەرن (herin) بە مانای (ڕۆیین)ە لە شێوەی ژووروودا. بۆ وێنە:

ez diherim ... htd. = min deřom... htd.
ez narim ... htd. = min nařom... htd.

(٤٩) ـ ((بوون)) کارێکە بۆ چەند مەبەستێک بەکاردێ. جارێک بە مانای (کینونة) دێ کە ئەمیان لە شێوەی کرمانجیی ژووروودا هاوتایەکی هەیە، ئەویش (بوویین bûyin)ە. جارێکی دیش بە مانای (صیرورة) بەکاردەهێنرێ. هەروەها هێندێ جاریش بە مانای ((هەبوون)) پیش بەکاردەهێنرێ. بۆ وێنە:

١ ـ پاش ئاوابوونی ڕۆژ، نان دەخۆم (کینونة).
٢ ـ دەبێ بە وەزیر، بەڵام نابێ بە مرۆڤ (صیرورة).
٣ ـ ئەگەر کوڕم بوو، نێوی دەنێم ئاقان (هەبوون).

ئەوەی شایانی باسە، کاری نا (نفی)ی ((بوون))، لە هەردوو شێوەکەدا وەک یەکە. بۆ وێنە:

ez dibim... htd = min debim... htd.
ez nabim... htd = min nabim... htd.

سەرنج :- ئاوەڵنێو لە هەردوو شێوەکەدا پێش کاری ((بوون)) دەکەوێ. بۆ وێنە، دەگوترێ ((ئەز نەخۆش بووم)) ـ واتا ((من نەخۆش بووم)) و ناگوترێ: ((ئەز بووم نەخۆش)) ـ واتا ((من بووم نەخۆش)).

(٥٠) ـ ((وەرین)) بە مانای ((هاتن)) دێ. ئەم کارە لە کرمانجیی ژووروودا ماوە، بەڵام لە کرمانجیی نێوەڕاستدا، تەنیا دەکاتی فەرمان، واتا "وەرە" ماوە.

(١ ٥) ـ دوو کار هەن ((زانین)) و ((کارین = توانین)) کە (نا) یان لێ کرا، ئەوسا ئامرازی ((نا)) دەبێتە ((نـ ni)) . ئەمانەش تاك هەڵکەوتوون . بۆ وێنە:

ez dizanim...htd. --- ez <u>ni</u>zanim...htd.

ez dikarim...htd. --- ez <u>ni</u>karim...htd-

جا ئەگەرچی ئەم دووانە نە شێوەی کرمانجی ی ژووروودا؛ لە رێزمان لایان دا وە، بەڵام لە شێوەی نێوەڕاستدا بەڕاستی بەکاردێن . بۆ وێنە:

min dezanim...htd.

min <u>na</u>zanim...htd.

(٢ ٥) ـ ئەم دوو وێنەیەی دوایی: (بەزیانی) و (بەزهانی)؛ کەم بەکاردێن .

(٣ ٥) ـ ئەم دوو وێنەیەی دوایی: (رەڤیایی) و (رەڤهانی)، کەم بەکاردێن .

(٤ ٥) ـ تەماشای باسی (وە) و (ڤە) بکە (ل ٢٩ ـ ٣٠) .

(٥٥) ـ کە دەگوترێ (ل)ی قەڵە و لە شێوەی کرمانجی ی ژووروودا نی یە؛ مانای وانی یە کە ئەم دەنگە لەم شێوەیەدا دەست ناکەوێ . بەڵکو مەبەست ئەوەیە شێوەی کرمانجی ی ژووروو، هیچ نرخێك بۆ ئەم دەنگە دانانێ . واتا (ل)ی سووك و (ل)ی قەڵە و لە یەك جیاناکاتەوە، وەك کرمانجی ی نێوەڕاست . بۆ وێنە؛ وشەیەکی وای نی یە وەك ((کەل)) و ((کەڵ)) کە بە (ل)ی سووك مانایەك بدا و بە ((ل)ی قەڵە و مانایەکی دی بدا . ئەگینا لە شێوەی کرمانجی ی ژوورووشدا وشەی وا هەن ـ بەڵام کەم ـ کە (ل)ی قەڵەویان تێدایە . بۆ وێنە: (لەم) ـ واتا (کوڵم) و وشەی (پلاڤ) و (مەلا) لە زاراوای بادینانەدا و وشەی (لات) ـ واتا (گابەرد) و (بەڵ) ـ واتا (دەم کردنەوەی گوڵ) لە زاراوای (تربا سپی)ی کوردستانی سووریادا .

(٦ ٥) ـ وشەی ((گاو)) کە بە مانای (کات)ە و لە شێوەی کرمانجی ی ژووروودا وەك ((گاڤ)) دەردەبڕێ، لە شێوەی کرمانجی ی نێوەڕاستدا لە وشەی ((چێشتەنگاو)) دا دەبینرێ ـ واتا (کاتی چێشت) ـ هەروەها هەر لەم شێوەیەدا، جارێك دەبێتە (کات) و جارێکی دی دەبێتە (گاو) ـ سەرنجی وشەی (ناگاو) بدە ـ و جارێکی دیش دەبێتە ((قاف)) ـ سەرنجی رستەی (لە قافی خۆی دا قسە دەکا) بدە .

(٧ ٥) ـ ((کەڤۆك)) واتا ((کۆتر)) . ((کەڤۆك)) خۆی ((کەوۆك))ە؛ واتا ((کەوێکی پچووك)) .

(٨ ٥) ـ وشەی ((هەیڤ)) بە وێنەی ((هەیو)) لە کرمانجی ی نێوەڕاستیشدا هەیە . سەرنجی ئەم گۆرانی یەی خوارەوە بدە کە لە گەرمیانی دەوروبەری کەرکووك دەگوترێ:

مانگە شەوە، هەیوە شەوە × گۆرانەحیزەی چاو لە خەوە

(٩ ٥) ـ ((خوەردیان)) واتا ((پاسەوان)) کە هێندێ جاریش بە کرمانجی ی نێوەڕاست ((وەردیان))ی پێ دەڵێن؛ وشەیەکە لە (gardien)ی فەرەنسی یەوە وەرگیراوە .

(٦٠) ـ تەماشای کتێبی ((شاهنامۀ حقیقت)) ـ تاریخ منظوم بزرگان اهل حق، أثر: حاج نعمة الله جیحون ابادی مُکری متخلص بە مُجرم؛ بکە کە لەلایەن دوکتۆر محەممەدی موکری یەوە لە ١٩٦٦ دا لە پاریس بڵاوکراوەتەوە (ل ٤٢).

(٦١) ـ لەمەولا ووشە فارسی یەکان، وەك ووشە کوردی یەکان، بە رێنووسی لاتینی ی کوردی دەنووسم، تا جۆری دەربڕینیان لە فارسی دا بەراستی پێشان بدەم.

(٦٢) ـ دیارە تیپە دەنگدارەکە چونکە (بزرۆکە) یە دەرناکەوێ بە تیپی لاتینی نەبێ. لەبەر ئەوە ئەو ووشانە وا بە تیپی لاتینی دەنووسمەوە:

bisû, bişo, biço, bitorê, bike, bixo, biqepêne.

(٦٣) ـ ووشەکان بە تیپی لاتینی وایان لێ دێ:

pisû, pişo, piço, pitorê, pike, pixo, piqepêne

سەرنج: تۆنیق وەهبی شتێکی باش ناکا کە ئەم ((بکە)) و ((بخۆ)) و... هتد بە ((پکە)) و ((پخۆ)) و ... هتد دەنووسێ.

(٦٤) ـ ووشەی ((خێو))؛ تا ئێستەش لە زاراوای سلەیمانی و گەرمیان و هێندێ زاراوای دی شێوەی کرمانجی ی نێوەڕاستدا ماوە، وەك ووشەی ((بەخێو کردن))، واتا ((بە خاوەن کردن)).

(٦٥) ـ ووشەی ((بێر)) لە کرمانجی ی نێوەڕاستیشدا هێشتا ماوە. بۆوێنە: سەرنجی ووشەی ((خێر و بێر)) بدە کە ئەمە ((خێر و بەر))ە.

(٦٦) ـ سەرنجی پەراوێزی ژمارە (٥٦) بدە.

(٦٧) ـ "کۆڕی زانیاری کورد" ووشەی ((تۆم))ی لەجیاتی (منی)ی عەرەبی بەکار هێناوە. بۆوێنە (الحویصلة المنویة)ی بە (تۆمدان) وەرگێڕاوە. تەماشای "زاراوی هەمە چەشنە ـ دانان و لێدوانی ئەنجومەنی کۆڕ و لیژنەکانی ـ پێشەکی و رێکخستنی د. ئەوڕەحمانی حاجی مارف، چاپخانەی کۆڕی زانیاری کورد، بەغدا - ١٩٧٤ ل ٣٦ بکە. ئەمە راست نی یە. (تۆم) و (تۆو) هەر یەکە. (تۆم) وێنە یەکی فارسی یە و (تۆو) وێنە یەکی کوردی یە.

(٦٨) ـ ئەم ووشەیە لە فارسی کۆندا و لە لەوحەی ((داریوش)) دا دەبینرێ، کاتێ کە ((داریوش)) دەڵێ: ((ئەدەم دارا یەوش ... هتد)) واتا ((ئەز داریوشم)).

(٦٩) ـ سەرنجی ووتەی ((منداڵ و مەرزم)) بدە.

(٧٠) ـ (دول) لە زمانی فارسی ی تازە دا بە بێ شەرم و ئابڕوو دەڵێن، کە بەرامبەرەکەی بە کوردی (زۆڵ) دەگرێتەوە.

(٧١) ـ (دوال) بە فارسی ی تازە بە پشتێنی چەرمین دەڵێن. ((زوێڵ))ی کوردیش بۆ نێوانی چەرمێکی تایبەتی بەکاردێ (تەماشای پەراوێزی ژمارە ٧٢ بکە).

(٧٢) ـ (زوێڵ) بە کوردی ی ئەردەلان، نێوی پارچە چەرمێکی تایبەتی یە.

(٧٣) ـ (دنج) بە فارسی بە جێی گچکەی تەنیا دەڵێن. (زنج)ی کوردیش بە ژووری گچکەی لە پووش و چیلکە و قامیش دروستکراو دەڵێن.

(٧٤) ـ هێندێکیش پێی دەڵێن ((زرێوار)) ـ تەماشای پەیوەندی دەنگی (و) و (ب) بکە (ل ٦٠ ـ ٦١) ٠

(٧٥) ـ هێندێ لە دوژمنە نەفامەکانی کورد، هەوڵ دەدەن لەم رێیەوە کورد سووك بکەن و بە گەلێکی بێ کولتووری بدەنە قەڵەم. بەڵام لە و رێیەوە تەنێ گەوجێتی ی خۆیان دەخەنە روو ٠ بۆ وێنە تورکە تۆرانییەکان لە کۆنەوە دەنووسن: ((زمانی کوردی چەند سەد وشەیەکە و وشەکانی دی هەموو وشەی بێگانەن ٠ تەنانەت رۆژنامەنووسێکی تورك لە تەلەفزیۆنی ئەڵمانی ( ZDF ) دا لە رۆژی ٦/ ٤/ ١٩٧٥ و لە پرۆگرامی Internationale Frühschoppen دا زۆر بە شانازییەوە ئەمەی گوت ٠ راستی یەکەی هیچ زمانێك نییە وشەی بێگانەی تێدا نەبێ و بوونی وشەی بێگانەش لە زمانێکدا شەرم و شوورەیی نییە بۆ ئەو گەلەی بەو زمانە قسە دەکا ٠ ئەگەنا ئەو 'شەرم و شوورەیی' یە لە پێشدا ملی دراوسێکانی کورد دەگرێتەوە، ئەوجا کورد ٠ چونکە زۆر دوور نەرۆیین، زمانی تورکی، هەزاران وشەی لە بابەتی خوارەوە لە زمانی کوردی وەرگرتووە ٠

"çerçeve" (چوارچێوە) - "hoşav" (خۆشاو/ ئاو) - "çucik" (واتا منداڵ کە لە "جووجك" ەوە هاتووە ٠ - "manda" (مانگا) - "serhoş" (سەرخۆش) - "çarşaf" (چارشێو) - "çepraz" (چەپ راست) - "peçe" (پەچە) و ٠٠٠ هتد ٠ زمانی فارسی و عەرەبی لەم رووەوە هەروانە ٠ بەڵام بە بیروڕای مـن، ئەوانەی خۆیان بەم "کەموکورتی" یەی زمانی کوردییەوە بادەدەن، نازانن کە زمانەکانی خۆشیان ئەم "شەرم و شوورەیی" یە رووی تێ کردووە، ئەگەنا باسی زمانی کوردییان نەدەکرد ٠ بۆ وێنە لە بیرمە کە لە ساڵی (١٩٥٧) دا لە قوتابخانەی ناوەندیی زوبێر مامۆستای ماتماتیك بووم، ئەودەمە لە زوبێر تەنیا (١٧) کورد هەبوون ٠ یەکێك لەوانە، ناوی (کاکە عومەر) بوو، تاکسی لێ دەخوڕی. زۆر کوڕێکی باش بوو و زۆر پێش بووبووینە برادەر ٠ ئەم کاکە عومەرە بۆی گێڕامەوە کە کابرایەکی کۆنەمەلا، لە بەسرە هەیە، عەرەبی و فارسی و تورکی باش دەزانێ و سەریشی لە کوردی دەردەچێ و بە تەمایە کتێبێك لەسەر ئەوە بنووسێتەوە کە زمانی کوردی زمانێکی تێکەڵە و تەنیا لە وشەی عەرەبی و فارسی و تورکی و هێندێ دروستبووە و بۆ ئەمەش لە بارەگای (جمعية الاصلاح الاجتماعي) لە زوبێر ووتارێکی خوێندووەتەوە ٠ ئەوە ناچاری کردم کە منیش ووتارێك هەر لە وێ بە ناوی ((رفعُ الاوهام و دفعُ التضليل، عمّا في اللغة الكردية مِنَ الدَخيل)) بخوێنمەوە ٠ کە لە خوێندنەوەی ووتارەکە بوومەوە و کەوتینە وتوێژ، بۆم دەرکەوت کە ئەو کابرایە و تەواوی ئەوانەی لە وێ بوون، بۆ یەکەم جار گوێیان لێ بوو کە زمانی عەرەبی وشەی بێگانەی تێ دایە و هەموو زمانێکی دیش بێ وشەی بێگانە نابێ ٠

(٧٦) ـ تەماشای ئەم سەرچاوەیەی خوارەوە بکە:

Gerhard Doerfer: "Türkische und mongolische Elemente im Neupersischen", Bds. 1-4, Wiesbaden, 1963-1975.

(٧٧) ـ وشەی ((تەواو) و (نەفام) و (ناشی) و (مشار) و (وڵات) لە وشەی عەرەبی: (تمام) و (نا فهم) و (ناشئ) و (منشار) و (ولاية) ەوە هاتوون ٠

(٧٨) ـ شێوەی راستی کوردی ((گورگ)) ـ "ڤەرگ" ە کە هێشتا لە هەورامی دا ماوە

و به ئائێستاش warka یـە · ووشـەی ( سپڵـە ) لە بنەڕەتدا لە ( سافـل ) و ( سفلـی ) ی عـەرەبـی یەوە وەرگیراوە، بەڵا م لە ڕێی زمانـی فارسی یەوە هاتووەتە نێو کوردی · ئێستـاش لە هـەولێر بە ( سپڵـە ) دەڵێـن ( سفلـە ) · لە زاراوای سلەیمانـی دا ( ف ) بـووە بە ( پ ) و ئەمەش شتێکـی ئاسایـی یـە · چونکـە دەنگـی ( پ ) دەنگێکـی کوردی ی کۆنـە بەرامبـەر بـە ( ف ) ی فارسـی و سـا مـی · بـۆ وێنـە: ئە م ووشانـە ی خوارە وە لەگەڵ یەك بەراورد بکـە؛

| کـــــوردی | فـــــارسی | |
|---|---|---|
| پـــۆ لاَ | فـــو لا د | fûlad |
| پەرەستێلکە/ پەرەسلێرکە (موکریانی) | فرستـوك | ferestûk |
| پـیـرۆز | فـیـرو ز | fîrûz |
| پـەڕپـووت · | فـرتـوت | fertût |
| سـپـێنـە | سـفـیـد ە | sefîde |

بـەڕلـی ( پ ) لە ( ف ) کۆنترە · لەبەر ئەوە دەبینیـت ((سپـی دار = سپیند ار ) ) لە عەرە بـی دا بـووە بە ( اسفنـد ا ر ) و ( پیـل ) یـش وێنـە یە کـی کـۆنـی ( فیـل ) ە، ئەوەی شایانـی باسـە ئەوە یـە؛ هێندێ جار ( پ ) و ( ف ) لە کوردی دا و لە هێندێ ووشە دا؛ لە تەنیشـت یەکەوە و بـۆ یەك مەبە ستبەکاردێـن · بۆ وێنـە ووشـەی (( سـپـوور ) ) و ( سفـوور ) لەگەڵ یە ك بەراورد بکـە کە هەردووکیان بـۆ ( قڕاش ) لە کرماشان بەکار دێـن · هـەروەها ووشـەی ( پیـت ) و ( فیـت ) لە ( فەڕ و فیـت ) و ( پیـت و بەرەکە ت ) دا کـە هـەردووکیان یە ك مانایان هـە یـە · یا ووشـەی ( پـرتـە ) و ( فـرتـە ) هێنـدێ جار یەك مانایان هـە یـە · بۆ وێنـە بە ( پـرتە پرتـی چرا ) دە ووترێ ( فـرتـە ) ·

(٧٩ ) ــ ووشـەی ( تووش ) و ( قورقـوشـم ) و ( قاپ ) و ( ئازووخـە ) و ( ئـە مـە ك ) و ( دەباشیـر ) و ( پاقـلاوە ) و ( برغـوو ) و ( چاوەش ) و ( تە ل ) لە ووشـەی تـورکـی:
(baklava) ,( tebeşir),(yemek ) , (azik ) ,( kapak ) ,( kurşun ) , (tuş ) , ( çavuş ) , (burgu ) , ( tel ) وەرگیراون.

( ٨٠ ) ــ ووشـەی ( خەبات ) و ( خشـڵ ) و ( لە واشـە ) و ( ناتـرلو ) ( کە رەوز ) لـە ووشەی : ( ܚܒܛܐ ) خُواطة ، ( ܝܥܕ ) خِشّـر ، ( ܠܚܟܐ ) لاواشـە ، ( ܢܛܘܪܐ ) نا طُـورا ، ( ܚܨܚ ) کَراوَس ی سریانـی یەوە وەرگیراون ·

( ٨١ ) ــ ووشـەی ( مەگریت ) و ( خـیـم ) و ( تیـرمێـخ ) لە ووشـەی ( մարգարիտ ) و ( Հիմք ) و ( տրմուխ ) ئەرمەنی یەوە وەرگیراون.

( ٨٢ ) ــ ووشـەی ( زیـو ) و ( کنگـر ) و ( سنوور ) و ( تە لیسـم ) و ( سـە متـوور ) لە ووشـەی [ ἄσπος ] و [ κόναρα ] و [ σύνορος ] و [ τέλεσμα ] و [ ψχλτήριον ] ی یۆنـانـی یەوە وەرگیـراون ·

( ٨٣ ) ــ ووشـەی ( پاپـۆڕ ) و ( لەوانتـە ) و ( وەردیان ) لـە ووشـەی · ــ vapeur و lavande و gardien ی فـەڕەنسـی یەوە وەرگیراوە ·

( ٨٤ ) ــ ووشـەی ( پانتۆڵ ) و ( نمرە ) و ( زەڵاتـە ) لە ووشـەی · ــ pantalon و numero و salata ی ئیتالیایـی یەوە وەرگیراوە ·

(٨٥) ــ ووشەی (فنش) و (بۆدی) و (کەرەنێل) و (گۆڵ) لە ووشەی ئینگلیزی finish و body و colonel و goal ەوە وەرگیراون ·

(٨٦) ــ ووشەی (سەماوەر) و (سپیچك) و (بۆڵشەویك) لە ووشەی رووسی CAMOBAP و СПИЧКА و БОЛЬШЕВИК ەوە وەرگیراون ·

(٨٧) ــ ((پتر)) لە ((پرتر)) ەوە هاتووە · ((پر)) بە شێوەی کرمانجی ی ژووروو بە مانای (زۆر) دێ · هێندێ نووسەر ووشەی ((پترتر)) بۆ (زۆرتر) بەکار دەبەن ، ئەمەش هەڵەیە · (پترتر) ــ (زۆرترتر) دەگرێتەوە ·

(٨٨) ــ (کوچك) ووشەیەکی کرمانجی ی ژووروو ە بەرامبەر بە (سەگ) · بە زمانی بەلووچیش بە (سەگ) دەڵێن (کووچەك) · شایانی باسە کە زمانی بەلووچی، وەکو کوردی، زمانێکی باکووری رۆژاوای ئێرانە و دەستە خوشکی زمانی کوردی یە ·

(٨٩) ــ ئەمە (٥٠) ساڵ پترە کە لەگەڵ لێ سەرچاوەی کوردی و بێگانەدا هەواڵێك بڵاو دەکرێتەوە بە وبۆنەیەوە کە گوایە دەروێشێك لە دەشتی شارەزوور پارچە پێستێکی دۆزیوەتەوە بە رێنووسی پەهلەوی چوار دێڕ هۆنراوەی کوردی لەسەر نووسراوە، کە هۆنەرەکەی گوایە ئاخ وداخی هەڵکێشاوە بۆ ئایینی زەردەشتی کە چۆن لەلایەن هێرشبەرانی عەرەبی موسوڵمانەوە لە نێو براوە و سکاڵا لە دەست ئەو هێرشبەرانە دەکا کە چۆن ژن وکچی کوردیان بە دیل گرتووە و خوێنی خەڵکیان رشتووە · ئەوی راستی بێ؛ ئەم هۆنراوەیە هۆنراوەیەکی ساختە و دەستکردە و بە پێی زانستی زمانەوانی دەتوانین پێشانی بدەین کە کوردی یەکەی ناتوانێ ببێتە کوردی ی دەوروبەری پەیدا بوونی ئیسلام ·

بێجگە لەوەش کتێبێك هەیە بە نێوی ((شوق المستهام فی معرفة رموز الاقلام)) ەوە، کە گوایە ((احمد بن وحشیة النبطی)) لە ٢٤١ ی کۆچی دا نووسیویەتەوە · لە وێدا نووسەرەکەی جۆرە ئەلفوبێیەکی زۆر سەیر دەخاتە بەرچاو و دەڵێ کە گوایە ((سێ بەرگ کتێبی کوردیی لە کتێبخانەیەکی بەغدا دا دیوە؛ بەو ئەلفوبێ سەیرە نووسراونەتەوە)) · ئەمجا دەڵێ: ((ئەو ئەلفوبێیە هێندێ تیپی تایبەتی تێدایە کە لە هیچ زمانێکی دیدا نی یە و ··· هتد)) (تەماشای: گیوی موکریانی: ((گیونامە)) ــ هەولێر ١٩٦٠ / ٢٥٧٢ ل٢٠ــ٢١ بکەن) · ئەوەی راستی بێ؛ تاقە سەرنجێکی کورتی ئەو کتێبە کە بە عەرەبی نووسراوەتەوە، بۆمان دەردەخا کە نابێ عەرەبی زانێکی بە نێوبانگی وەك ئەحمەد کوڕی وەحشیەی نەبەتی نووسیبێتی یەوە؛ بەڵکو دەبێ بێگانەیەك رێکی خستبێ کە عەرەبیشی باش نەزانیبێ ·

ئەم قسانەم ئەوە ناگەیەنن کە کورد ئەو دەورە، یا پێش ئیسلام، هیچی نەنووسیوە و خەتی نەبووە، بەڵام هەتا ئێستە ئەو بەڵگانەمان نەکەوتوونەتە دەست، یا بە جارێك لە نێوچوون و نەماون ·

(٩٠) ــ تەماشای ئەم دوو سەرچاوەیەی خوارەوە بکە:

1)- Major E.B. Soane, C, B, E. : "Elementary Kurmanji Grammar", Baghdad, 1919.
2)- Major E.B. Soane, C, B, E. : "Kitabi Awwalamini Qiraati Kurdi", Baghdad, 1920.

(٩١) ـ تەماشای ئەم سەرچاوەیەی خوارەوە بکە :

Mîr Hêrekol Azîzan: "Rêzana Elf û bêya Kurdî", Şam, 1 9 3 2.

(٩٢) ـ تەماشای ئەم سەرچاوەیەی خوارەوە بکە :

Kamuran Bedir-Xan: "Elf û Bêya min", Şam, 1938.

(٩٣) ـ تۆفیق وهبی : ((حول مقال مسؤولیة الادیب الکردی الکبری، للاستاذ عبد المجید لطفی)) بکە ؛ لە گۆڤاری ((پەروەردە و زانست)) ژمارە (٥)، ساڵی (٣)، بەغداد ؛ بەهاری ١٩٧٣ ، ل ٨٧ .

(٩٤) ـ "کۆڕی زانیاری کورد" بەپێی قانوونی ژمارە (١٨٣)ی ساڵی ١٩٧٠ لەلایەن ((مەجلیسی سەرکردایەتی شۆڕش)) ەوە لە عێراق دامەزرێنرا و لە ژمارە (١٩١٧)ی ڕۆژی ٨/٩ی ١٩٧٠ی ڕۆژنامەی (الوقائع العراقیة) دا بڵاوکرایەوە .

(٩٥) ـ تەماشای ((ڕێنووسی کوردی))ی کۆڕ بکە لە ((گۆڤاری کۆڕی زانیاری کورد)) دا ـ بەرگی یەکەم، بەشی یەکەم ـ بەغدا ١٩٧٣ .

(٩٦) ـ محمد ملاکریم : ((هەنگاوێکی تر بە ڕێگای دانانی دەستوورێکدا بۆ نووسینی کوردی))، لە گۆڤاری ((نووسەری کورد)) دا، ژمارە (٨)، بەغدا، مایسی ١٩٧٣، ل ٧ ـ ١٣ .

(٩٧) ـ شیخ محمد مردوخ کردستانی : ((کتاب فرهنگ مردوخ)) جلد اول ودوم، چاپخانه ارتش، تهران (١٩٥٦ ؟) .

(٩٨) ـ ئەم ڕووداوە لە ووشەی بێگانەشدا دەبینین . بۆوێنە ((ڕؤوف)) لە کوردیدا دەبێتە ((ڕەووف))، واتا دەبێ بە سێ (و) بنووسرێ . بەڵام کە بە لاتینی بنووسرێ وا دەنووسرێ : Rewûf

(٩٩) ـ لە پاشەڕۆژدا، بە نامیلکەیەکی تایبەتی باسێکی ئاینەکانی کورد ؛ کۆن و تازەیان دەکەم و لەویدا تێکستی هەردوو کتێبە پیرۆزەکەی ئێزدییەکان، لەگەڵ نوسخەکانیان و ترازەکانیان بە لێکۆڵینەوە و لێ دووانەوە لە چاپ دەدەم .

(١٠٠) ـ لێرەدا پێویستە بزانین کە ئەلفوبێی لاتینیش یەك جۆرنی بەوگەلێك چەشنی هەیە . ئەگەر چی لاتینی بەدرخانی یەکان کە لەلایەن نووسەری ئەم ووتارەوە ناتەواویی یەکانی چاك کراون (تەماشای ل ٨١ـ٩٠ی ئەم نامیلکەیە بکە)، تەنیا ئەلفوبێ یەکە کە جێی خۆی گرتبێ . بەڵام ئەوانەی دەیانەوێ ئاشنای ئەم ئەلفوبێ لاتینی بە جۆرجۆرانە ببن، با تەماشای ووتاری کوردەوانی فەرەنسەیی؛ پرۆفیسۆر تۆماس بوا بکەن؛ لە گۆڤاری ((al-Machriq)) دا کە بە زمانی فەرەنسی نووسیونی :

R.P.Thomas Bois: "Comment écrire le Kurde ?" ; "al- Machriq", Beyrouth, Mai-Juin 1965, pp. 369-378.

(١٠١) ـ تەماشای ئەم سەرچاوەیەی خوارەوە بکە :

carl Brockelmann: "Arabische Grammatik", Leipzig 1948, S.1.

(١٠٢) ـ مەبەستم لەمە ئەوە نییە کە ووشەی زاراوا و شێوەکانی دی، تێکەڵ بە نووسینی کوردی نەکرێ. نەخێر! ئەوە بە تەواوی پێچەوانەی بیروباوەڕی من و ئامانجی ئەم کتێبەیە. مەبەستم ئەوەیە هەر ووشەیەك وەرگیرا، دەبێ بە حساب و بە دەستووری تایبەتی زمانەوانی وەربگیرێ، نەك بە هەرەمەیی و هەرکەس بۆ خۆیی.

(١٠٣) ـ لە بارەی زەردەشتەوە کە لێك لێکدانەوە و بیروڕا هەیە. هێندێ لەوانە وا دەگەیەنن کە زەردەشت جۆتکار و شەپان بووبێ کە ئەمەیان بیروباوەڕی منیشە. بۆ ئەمە تەماشای ئەم سەرچاوەیەی خوارەوە بکە بە زمانی ئەڵمانی:

Bernfried Schlerath: Zarathustra, Darmstadt 1970.

(١٠٤) ـ تەماشای ئەم سەرچاوەیەی خوارەوە بکە:
"The Kârnâmak î Artakhshîr î Pâpakân", ed. of Darab Dastur Peshotan Sanjana, Bombay 1896, p.22 & p.52.

(١٠٥) ـ فەردوسی: ((شاهنامە)) ـ چاپ موسکو. لە (٨) بەرگدا بە سەرپەرشتی سمیرنۆڤا و ئوسمانۆف ١٩٦٣ ـ ١٩٧٠؛ بەرگی (٦) ل ١٣٨.

# لیستەی ناوەڕۆکی کتێبەکە

**بابەت** — **لاپەڕە**

| بابەت | لاپەڕە |
| --- | --- |
| ( ٢ ) ــ نێر و مێ ........................ | ٢٧ |
| أ ــ لە دۆخی خستنە پاڵدا (فی حالة الاضافة ) ............ | ٢٧ |
| ب ــ لە دۆخی کەسی سێیەمدا (فی حالة الشخص الثالث ) ..... | ٢٧ |
| جـ ــ لە دۆخی بانگکردندا (فی حالة النداء ) ............ | ٢٧ |
| ( ٣ ) ــ ئامرازی ناسینەوە (کە ) ــ اداة التعریف (کە ) ........ | ٢٨ |
| (٤ ) ــ پێشکۆی (ڤە ve ) و پاشکۆی (وە we ) ............. | ٢٩ |
| (٥ )ــ ئامرازی کردنە گەل (اداة الجمع) ............. | ٣٠ |
| ( ٦ ) ــ بەکارهێنانی تیپی پێوەندی (بۆ bo ) ............ | ٣٠ |
| (٧ )ــ پاشگری نێوی کارا (وو û ) و (ی î ) ی کارێکی تێنەپەڕ و تێپەڕ | ٣١ |
| (٨ ) ــ پاشگری نێوی بەرکار (راو -raw) و (رای -ray)ی کارێکی تێپەڕ . | ٣١ |
| (٩ ) ــ پاشگری نێوی تاك (لاحقة الاسم المفرد ) .......... | ٣٢ |
| (١٠ )ــ ئاوەڵنێوی ((تر )) و ((دی )) ................ | ٣٢ |
| (١١ ) ــ پاشکۆی دۆخ (لاحقة الحالة ) ............. | ٣٣ |
| (١٢ ) ــ جێ گۆڕکێی جێ نێوی پێوەنووساو ............ | ٣٣ |
| ( ١٣ )ــ کارەکان ...................... | ٣٥ |
| چەند ووشەیەك لەبارەی لێکسیکۆلۆژیی کارەکانەوە .......... | ٣٧ |
| گەردان کردنی کارەکان ................ | ٣٧ |
| گەردانکردنی کاری تێپەڕ و تێنەپەڕ ............. | ٣٨ |
| ١ ــ لە دەمی رانەبوردوودا ( المضارع ، الحاضر ) .......... | ٣٨ |
| (أ ) ــ لە دەمکاتی ئاگاداریدا (فی الحالة الدلیلیة ) ........ | ٣٨ |
| (ب )ــ لە دەمکاتی ئیحتیمالیدا (فی الحالة الاحتمالیة ) ........ | ٣٩ |
| ٢ ــ لە دەمی رانەبوردووی بەردەوامدا ( الحاضر المستمر ) ....... | ٣٩ |
| (أ )ــ لە دەمکاتی ئاگاداریدا ...................... | ٣٩ |
| (ب ) ــ لە دەمکاتی ئیحتیمالیدا ...................... | ٤٠ |
| (٣ ) ــ لە دەمی رابوردووی سادەدا ( الماضی البسیط ) ......... | ٤٠ |
| (أ ) ــ لە دەمکاتی ئاگاداریدا ...................... | ٤٠ |
| (ب ) ــ لە دەمکاتی ئیحتیمالیدا ................ | ٤١ |
| ( ٤) ــ لە دەمی رابوردووی ناتەواودا ( الماضی الناقص) ......... | ٤١ |
| (أ ) ــ لە دەمکاتی ئاگاداری دا .................. | ٤١ |
| (ب ) ــ لە دەمکاتی ئیحتیمالی دا .................. | ٤١ |
| (٥)ــ لە دەمی رابوردووی ناتەواوی بەردەوامدا (الماضی الناقص المستمر ) .. | ٤٢ |
| ( ٦ ) ــ لە دەمی رابوردووی تەواودا ( الماضی التام ) .......... | ٤٢ |
| (أ ) ــ لە دەمکاتی ئاگاداری دا .................. | ٤٢ |
| (ب ) ــ لە دەمکاتی ئیحتیمالی دا .................. | ٤٢ |
| ( ٧ ) ــ لە دەمی رابوردووی دووردا ( صیغة الماضی البعید ) ......... | ٤٣ |
| (ا ) ــ لە دەمکاتی ئاگاداری دا .................. | ٤٣ |
| (ب ) ــ لە دەمکاتی ئیحتیمالیدا .................. | ٤٣ |
| (ج) ــ لە دەمکاتی رابوردووی پێشووتری تەقریبی دا ......... | ٤٣ |
| دەمکاتی هاتوو (صیغة المستقبل) ............... | ٤٤ |

## بابـــەت — لاپەڕە

## بابەت — لاپەڕە

لمحة خاطفة عن كتاب

# لغة الكتابة الكردية الموحدة

لمؤلفه **جمال نبز**

يناقش الكاتب مراحل التطور التأريخي للغة الكردية الادبية نقاشا علميا وانيا ؛ مستهدفا من ذلك وضع مخطط واقعي رصين للاتيان بلغة كردية ادبية موحّدة وذلك وفق مبادئ علمية تستند على قاعدة الدمج المدروس للهجتين الادبيتين الأساسيتين المستعملتين حالياً ؛ وهما لهجة الجزيرة والتي يستعملها اكراد تركيا و سوريا و الاتحاد السوفياتي و لهجة السليمانية والتي يستخدمها اكراد العراق و ايران .

ويستهل المؤلف جمال نبز بحثه هذا بعرض شامل لأهم العوامل الاجتماعية والسياسية والدينية والاقتصادية التي ادّت، عبر التاريخ ، الى اعاقة نشوء لغة كردية ادبية موحّدة . ثمّ يبحث بالتفصيل عن الاوضاع التي ادّت الى قيام لغة كردية ادبية في امارة بوتان ؛ يستعملها الناطقون باللهجة الكردية الشمالية (او الكرمانجية الشمالية ) منذ القرن السادس عشر وذلك على اساس تبني لهجة منطقة الجزيرة . كما ويسهب في شرح الظروف التي ادّت الى قيام لغة كردية ادبية اخرى في امارة بابان ، يستخدمها المتكلمون باللهجة الكردية الوسطى والجنوبية (او الكرمانجية الوسطى و الجنوبية ) منذ بداية القرن التاسع عشر وذلك على اساس تبني لهجة منطقة السليمانية . ثم يتطرّق الى الاسباب التي ادّت الى تطور اللهجة الاخيرة تطوراً سريعاً واسعاً في القرن العشرين حتى اصبحت لغة الادباء الاكراد في العراق و في ايران ، رغم انها عجزت عن ان تصبح اللغة الادبية لاكراد تركيا و سوريا و الاتحاد السوفياتي ايضا .

و يرى المؤلف ان ايّة محاولة يقوم بها المثقفون الكرد بغية فرض احدى اللهجتين الادبيتين المذكورتين ، وبوضعهما الحاليّين ، ما هي الا محاولة يائسة تبوء بالفشل الذريع المحتوم ، لأن تحقيقهما أمر يُعَدُّ من المستحيلات. الا انّه يجد انّ تكوين لغة ادبية لجميع الناطقين باللغة الكردية ، على اختلاف لهجاتهم ومناطق سكناهم ؛ ليس امراً مستحيلاً ابداً ، رغم انّه صعب المنال . كما وانّه يعتقد انّه يجب انْ يُشرَعَ بهذا العمل الذي هو واجب وطني وعلمي معا ، من كردستان العراق . ذلك لا ن اكراد العراق يتمتعون بقسط معين من الحرية الثقافية ، لا يتمتع بها اكراد سائر اجزاء الوطن الكردي. ورغم انّ المؤلف يرى انّ اتخاذ اللغة الادبية الكردية المستعملة حالياً في العراق كقاعدة لبناء صرح اللغة الادبية الموحّدة عليها ؛ امرٌ لا مناصَ منه ،

إلاّ انّه يعتقد جازماً؛ انّ هذه اللغة يجب ان تجرى عليها اصلاحات جذرية هامة. هذا و اوضح المؤلّف انّ لغة الكتابة الموحّدة لا تُولَدُ عن طريق خلط اللهجة الادبية المستعملة اليوم في العراق بمفردات سائر اللهجات او اللهجتين الاساسيتين خلطاً دون نظام او قياس؛ كما يرى البعض، بل تتأتّى عن طريق دراسة اللغة الكردية دراسة فيلولوجية تأريخية علمية مستفيضة، وذلك بمقارنة اللهجات الاربع للغة الكردية. ببعضها بصورة عامة واللهجتين المذكورتين (الشمالية و الوسطى) ببعضهما بصورة خاصة وذلك من النواحي المورفولوجية والفونولوجية والليكسيكولوجية و الاورتوغرافية، مع اخذ التطور التأريخي للغة الكردية بالنسبة للغات الاخرى التابعة لشعبة اللغات الهندية الايرانية بنظر الاعتبار دوماً. ثم اصلاح اللغة الكردية الادبية المستعملة حاليا في العراق على اساس اقتباس التراكيب النحوية و المفردات القاموسية الاصيلة التي اهملتها اللهجة الادبية الوسطى تماما ولكنها لا زالت تتوفر في اللهجة الادبية الشمالية او اللهجات الاخرى وكذلك بتر كافة التراكيب النحوية والمفردات القاموسية الموجودة في اللغة الادبية الحالية لاكراد العراق والتي لا تتفق مع التطور التأريخي الصحيح للغة الكردية، مع الاستعاضة عنها بالتراكيب والمفردات الموجودة في اللهجة الشمالية او اللهجات الاخرى، بما يتفق والتطور التأريخي المنسجم للغة الكردية. هذا وقد استشهد المؤلّف في بحثه هذا بشواهد كثيرة وادلة عديدة اقتبسها عن كافة اللهجات الكردية وسائر اللغات الايرانية القديمة و الحديثة وقدّم في نهاية كتابه نصاً يتألف من عدة اسطر ليكون نموذجاً حياً للكتابة الكردية الموحدة التي يقترحها.

اما من حيث طريقة رسم اصوات اللغة الكردية، فانَّ المؤلّف يقترح اجراء اصلاحات ضافية على الابجدية الكردية المستعملة في العراق والتي هي صورة متطورة للابجديتين العربية والفارسية، لتفي بحاجة اللغة الكردية الى حد ما ويستطرد في ذكر مثالب هذه الالفباء، ويرى أنْ يتعلم الاكراد بجانب الابجدية الحالية ابجدية لاتينية متطورة، لانَّ الابجدية اللاتينية سهلة التعلم اولاً وتفي بالتعبير و الافصاح عن اصوات اللغة الكردية ايفاءً تاماً ايضاً.

و يوجه جمال نبز بحق مُرَّ العتاب وشديد اللوم الى ((المجمع العلمي الكردي)) القائم منذ ٨ ايلول ١٩٧٠ في العراق والذى لم يتمكن لحد الان ان يضع ايّ برنامج علمي محدد المعالم لخدمة و تطوير اللغة الكردية بما يتفق و متطلبات العصر الحاضر، ويرى أنَّ الذنب في ذلك لا يقع

إلاّ على عاتق البارتيين وقادتهم الذين كانوا اثناء مدهم المشؤوم في كردستان وإبانَ سيطرتهم اللاشرعية على المؤسسات الكردية في العراق، يوزعون المناصب والوظائف على اساسٍ مِنَ التحزب و التزلف والرياء، لا على اساس مِنَ الكفاءات والمؤهلات. الامر الذى ادى الى تكديس معظم المؤسسات الثقافية الكردية و من جملتها ما يسمى ب ((المجمع العلمى الكردى)) بعدد غفير من الذين كانوا قد حصلوا على مناصبهم بسبب انتماءاتهم الحزبية، دون النظر الى كفاءاتهم العلمية.

واخيراً وليس اخراً، فانّ هذا الكتاب ليس هو اول محاولة جدّية مثمرة من نوعها لخلق لغة ادبية موحدة للشعب الكردى باسره على اسس علمية واقعية مُقنِعَة وحسب، بل هو دراسة تحقيقية دقيقة ايضا، تُثبتُ بما لا يدَع اىَّ مجال للشك والريبة كَونَ اللغة الكردية لغة حية مستقلة قائمة بذاتها، لها تطوراتها التأريخية الخاصة. فهو بهذا برهان ساطع ودليل قاطع على طول باع مؤلّفه الذى قضى سنيناً طوالاً من عمره، عاكفاً على الدراسات العلمية المختلفة بصبر وصمود دؤوبين، واضعاً علمه فى خدمة الجماهير، كلما وَجَدَ الى ذلك سبيلا.

ومما يَجْدُرُ ذِكرهُ انّ المؤلّف قد كتب عام ١٩٧٥ بحثاً علمياً قيِّماً باللغة الالمانية حول نفس الموضوع وذلك بعنوان: لغة الكتابة الكردية ـــــ Die Schriftsprache der Kurden، طُبعَ ضمن مجموعة المقالات التى نشرها مشاهير علماء اوروبا فى مجلد خاص بعنوان:

Monumentum H.S.Nyberg, Acta Iranica II, Leiden 1975, S.98-122.

وذلك بمناسبة تأبين فقيد علم الاستشراق، العلامة نيبرغ N y b e r g. امّا هذا المؤلّفَ الذى نجده بين ايدينا، فكان قد فرغ من تأليفه فى شهر شباط من عام ١٩٧٤ وبعثه الى بغداد الى احد معارفه و كان هذا رئيساً لاحدى الدوائر الثقافية الكردية انذاك، ليطبعه له. ورغم انّ هذا الشخص الذى نحجم عن ذكر اسمه فى هذا المجال، قد قطع عليه عهداً بطبع الكتاب له فى العراق، الا انّه اهمل ذلك سنتين كاملتين، فلم يطبعه، كما ولم يُرجع اليه المخطوط المُعَدّ للطبع ايضا. فاضطر المؤلّف أنْ يعيد كتابة الكتاب وينظمه من جديد، ثم يطبعه على الة الطابعة الفارسية، مضيفا اليه بخط يده وبجهد جهيد، كلّ الاشارات والنبرات التى لم تتوفر فى الطابعة الفارسية. فاستغرق عمله هذا سويعات راحته لعدة شهور.

بانّ ((الاتحاد القومى للطلبة الاكراد فى اوروبا)) وهو الطليعة المناضلة الصامدة لاكراد اوروبا من الطلبة و العمال، وهو الذى قدم جملة من

الخدمات المشهودة للشعب الكردى، من الناحيتين العلمية و السياسية و فى احلك الظروف و الاحوال و رغم كل الصعوبات المادية و المعنوية ؛ يُسعِدُه جدا أنّ يساهم فى طبع هذا السفر النفيس وبهذه الحلة القشيبة، مضيفا بذلك مجداً اخراً الى امجاده الاخرى وخدمة جديدة الى خدماته السابقة، فى سبيل الجماهير الكردية ـ عملا لا قولا .

الاتحاد القومى للطلبة الاكراد فى اوروبا

اوروبا ـ ٢٥/ ١٢/ ١٩٧٥

iranischen Sprachgruppe in Betracht gezogen werden. Dabei festzustellende Unvollkommenheit und Abweichungen in den morphologischen, phonetischen und lexikologischen Entwicklungen sollen im Prozeß des vergleichenden Studiums vervollständigt und korrigiert werden.

Jemal Nebez spricht sich nicht für das gegenwärtig zumeist benutzte Alphabet aus, das eine variierte Form des arabischen und persischen Alphabets ist. Sein Vorzug gilt dem lateinischen Alphabet. Auf jeden Fall, meint Jemal Nebez, müsse aber das für die kurdische Sprache adaptierte persisch-arabische Alphabet weiter reformiert werden, wozu er ausführliche Erläuterungen macht. Die heutige politische Situation erlaube es nicht, das lateinische Alphabet zu übernehmen, fordert Jamal Nebez, doch müsse jeder Kurde- ungeachtet seiner Staatsangehörigkeit- das lateinische ABC lernen. Das lateinische Alphabet ist von Dschaladat Bedir-Khan (1887-1951) um 1932 für die kurdische Sprache erschlossen worden und in den fünfziger Jahren von Jemal Nebez reformiert und vervollständigt worden.

Am Ende seines Buches gibt Jemal Nebez eine erste kurze Probe der von ihm vorgeschlagenen Schriftsprache, und zwar in beiden Alphabeten.

Interessenten der Kurdologie und der Iranistik werden auf einen kürzeren Beitrag verwiesen, den Jemal Nebez auf Deutsch im "Monumentum H.S.Nyberg" in der Reihe "Acta Iranica", Heft II, Leiden 1975, S.97-122 veröffentlicht hat. Das vorliegende Buch in kurdischer Sprache ist eine bedeutend ausführlichere und umfassendere Darstellung.

Zusammenfassung:

NATIONAL-UNION KURDISCHER STUDENTEN IN EUROPA
(NUKSE)

am 5.1.1976

Zusammenfassung dieses Buches:

# DIE EINHEITLICHE SCHRIFTSPRACHE DER KURDEN

von Jemal N E B E Z

Thema dieses Buches ist die Problematik einer einheitlichen Schriftsprache für alle Kurden. Jemal Nebez beginnt sein Buch mit der Erläuterung jener Faktoren,die der Bildung einer Literatursprache im allgemeinen dienlich sind. Dann stellt er die -historisch zumeist ineinander arbeitenden- religiösen, geographischen, politischen und sozialen Hindernisse dar, die der Entstehung eine einheitlicher kurdische Schriftsprache bisher entgegenwirkten.

Sehr interessant ist seine Beschreibung der geschichtlichen Hintergründe, die dazu führten, daß im 16. Jahrhundert eine Schriftsprache in Nord-Kurdistan auf der Basis der Dschizira-Mundart und im 19. Jahrhundert eine andere Schriftsprache in Mittel-Kurdistan auf der Basis der Silaimani-Mundart zustandekamen. Die erstere stellte später die Basis für die Schriftsprache der Kurden in der Türkei, Syrien und in der UdSSR und die letztere entwickelte sich zur Schriftsprache der Kurden im Irak und Iran. Der Verfasser geht auch auf die Bemühungen im 20. Jahrhundert ein, wonach die Silaimani-Mundart sich als Schriftsprache weit und breit behaupten konnte. Soweit zum geschichtlichen Inhalt dieses Buches.

Der Verfasser ist der Meinung, daß keine der beiden Schriftsprachen in ihrer jetzigen Form als allgemeine Schriftsprache der Kurden gelten kann, ein solcher Versuch wäre unrealistisch und zwecklos. Er glaubt aber, daß die jetzige Schriftsprache der Irak-Kurden eine erste Basis für eine allgemeingültige und einheitliche Literatursprache abgeben kann, das aber nur nach ihrer weitgehenden Reform. Er ist nicht der Meinung, daß eine einheitliche kurdische Schriftsprache zustandekommen kann durch die unreflektierte Übernahme von Vokabeln aus der jeweiligen anderen Schriftsprache. Basis für eine zukunftgebundene einheitliche Schriftsprache kann, nach Jemal Nebez, nur ein vergleichendes Studium aller kurdischen Dialekte sein, besonder der beiden Hauptdialekte (Nordkurmandschi und Mittelkurmandschi auf denen die jetzigen beiden Schriftsprachen aufbauen. Bei diesem vergleichenden Studium müssen sowohl die morphologischen als auch die phonetischen als auch die lexikologischen Unterschiede berücksichtigt werden und die historische Entwicklung der kurdischen Sprache als G a n z e s und innerhalb der

language group must be taken into consideration. Any inadequacies or irregularities that may be ascertained in the morphological, phonetic and lexicological developments during the course of the comparative study should be supplemented and corrected.

Jemal Nebez ist not in favour of the alphabet most commonly used at the present time, which is a modified form of the Arabo-Persian alphabet. His preference is for the Roman alphabet. But in any case, Jemal Nebez says, the Arabo-Persian alphabet adapted for writing the Kurdish language ought to be further reformed, and on this matter he gives detailed explanations. The present political Situation, he says, does not permit an adoption of the Roman alphabet, but he makes an appeal that every Kurd-- no Matter what his nationality may be-- should learn the Roman ABC. In about the year 1932 the Roman alphabet was developed for writing the Kurdish language by Jaladat Bedir-Khan (1887-1951) and in the fifties reformed and improved by Jemal Nebez.

At the end of his book Jemal Nebez gives a first short example, in both alphabets, of the written language he proposes.

Those interested in kurdolegical Studies and in Iranology are referred to a shorter article in German published by Jemal Nebez in "Monumentum H.S.Nyberg" in the series "Acta Iranica", Vol.II, Leiden 1975, pp. 97-122. The present book in the Kurdish language is a substantially more detailed and comprehensive presentation.

Summary: NATIONL-UNION OF KURDISH STUDENTS IN EUROPE (NUKSE)

5th January, 1976

Jemal N e b e z

# TOWARDS A UNIFIED KURDISH LANGUAGE

## Summary

The subject of this book is the problem of a unified written language for all Kurds. Jemal Nebez begins his book with a discussion of those factors which contribute to the formation of a literary language in general. He then describes the -- for the most part historically interacting-- religious, geographical, political and social obstacles that have so far opposed the development of a unified Kurdish written language.

Of great interest is his account of the historical currents that led to the appearance in the 16th century of a written language in North Kurdistan on the basis of the jizira dialect and in the 19th century of another written language in Central Kurdistan based on the Silaimani dialect. The former subsequently provided the basis for the written language of the Kurds in Turkey, Syria and the USSR, and the latter developed into the written language of the Kurds in Iraq and Iran. The author also examines the endeavours made in the 20th century which enabled the Silaimani dialect to acquire a wide prevalence as a written language. So much on the historical content of the book.

The author is of the opinion that, in their present form, neither of the two written languages can serve as a standard written language of the Kurds, any attempt in this direction would be unrealistic and pointless. He thinks, however, that the current written language of the Kurds in Iraq could provide a first basis for a uniform literary language of universal validity, but only after a far-reaching reform. He is opposed to the notion that a standard Kurdish written language can be brought into being as the result of an unconsidered adoption of vocables from some other written language. A basis for a unified written Language that will meet the needs of the future can, in the opinion of Jemal Nebez, be furnished only by a comparative study of all the Kurdish dialects, particularly of the two chief dialects (North Kurmanji and Central Kurmanji) from which the two written languages of today are developing. In this comparative study attention nust be paid to the morphological as well as to the phonetic and the lexicological differences, and the historical development of the Kurdish language in all its forms and within the Iranian

Dedicated to

the memory

of

HUZNÎ M U K R I Y A N Î

- died 20/9/1947 -

